# نەخۆشییەکانی هەناو

## ( باطني )






دکتۆر کامەران ئەمین ئاوە

**هەندێك زانياريی سەبارەت بە**

# نەخۆشییەکانی هەناو

# (باطني)

**وەڵامی پرسیارەکانی ئێوە**

**(نەخۆشییەکانی دەزگا – کۆئەندامە-کانی هەرس، هەناسە، دڵ میزو میزەڕۆ)**

**دکتۆر کامەران ئەمین ئاوە**

**پێداچوونەوە**

**هاوار ئەحمەد**



**خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە**

● **نەخۆشییەکانی هەناو (باطني)**

● بابەت: پزیشکی

● نووسینی: د. کامەران ئەمین ئاوە

● نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی

● بەرگ: ڕێمان

● نرخ: (٣٠٠٠) دینار

● چاپی یەکەم : ٢٠١٣

● تیراژ: ٧٥٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

● لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٦٦) ساڵی (٢٠١٢)ی پێی دراوە.

**زنجیرەی کتێب (٧٧٣)**

ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

## پێرست

پێشەکی

برگەی ٢



برگەی ٣



برگەی ٤

## پێشەکی:

کتێبی"نەخۆشییە دەروونییەکان"(باطنییەکان) بە زمانێکی ئاسان باسی بەشێکی بەرچاو لە نەخۆشی‌یەکانی چوار دەزگای لەشی مرۆڤ وەکو هەرس، هەناسە، دڵ، چێکردن ومیزەڕۆ دەکات. نووسەری بابەتەکان تێکۆشاوە تا ڕادەی گونجاو بەبێ چوونە نێو قوڵایی بابەتەکانەوە، لەمەڕ شێوەی دەسنیشانکردن و چارەسەری نەخۆشی‌یەکان، زانیاریی پێویست بە خوێنەر بدا. ئەرکی ئەم کتێبە نەک نووسینی کتێبێک بۆ خوێندکارانی زانستگای پزشکیی، کە لە جێی خۆیدا کارێکی فرە پێویستە، بەڵکو ئاشناکردنی خەڵکی ئاسایی لەگەڵ ئەو نەخۆشییانەیە کە لەنێو کۆمەڵگادا باون. نووسینی کتێبی زانستیی بە تایبەت لە بواری پزیشکیی‌دا، بە پێی نەبوونی وشەگەلی پێویست کارێکی ئاسان نییە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دەکرێ و دەبێ ڕووناکبیرانی کورد بایخێکی زۆرتر بەم مەسەلەیە بدەن و تێبکۆشن تا ئەو ڕادەیەی کە دەکرێ لە پێناوی دەوڵەمەندکردن و ئەوڕۆیی‌کردنی زمانی کوردی و بردنەسەرێی ئاستی زانیاریی خەڵکی کورد ئەرکی خۆیان بەجێ بێنن. ڕووناکبیرانی کورد لە کوردستاندا بایەخی پێویست بە نووسینی بابەتی زانستی نادەن، ئەمەش بەشێکی دەگەڕێتەوە سەر ئەم ڕاستییەی کە لاوانی ئێمە بە زمانی ڕەسمی(فەرمی) ئەو وڵاتانەی کە تێیدا دەژین فێری زانستی پزشکیی، فیزیاو هتد .. دەبن . بەداخەوە خوێندکارەکانیش بۆ پەرەپێدانی زمانی زگماکی لەم بوارانەدا خۆیان زۆر ماندوو ناکەن، یان ڕێگای ئەو چەشنەکارەیان پێ نادرێ. هیچ گەل و نەتەوەیەک بێ پەرەپێدان بە کولتورو زانستی کۆمەڵگاکەی خۆی ناتوانێ ڕێگای گەیشتن بە ئاواتەکانی خۆی ببڕێ و بەشێکی ئەم ڕەوتە ئەرکی

سەرشانی ڕووناکبیران و پسپۆڕانی نەتەوەکەیە کە تێبکۆشن لە هەموو بوارێکی زانستییدا بە زمانی خۆیان بنوسن تا لە ڕەوتی پێش چوون و گەشەکردنی وڵاتەکەی خۆیاندا ڕۆڵیان گێڕابێ. ئەمڕۆ تەنانەت لکاندنی ٢ وشەی تازەی زانستی بە فەرهەنگی کوردییەوە، یا نووسینی بابەتێکی ساکاری زانستیش دەتوانێ یاریدەدەری ڕەوتی ئاگایی کۆمەڵگابێت لەم بوارانەدا. ئەوە ئەرکی سەرشانی یەک یەکی ئێمەیە.

لە کۆتاییدا نووسەر سوپاس و پێزانینی خۆی ئاراستەی مامۆستا "**حەسەن ئەیوبزادە**" دەکات کە لە بواری ڕێزمانی و پێشنیاری وشەگەلی شیاودا گەلێک یاریدەی داوە.

# بڕگەی (١)
# نەخۆشیی کۆئەندامی هەرس



# بەشی یەکەم

# برینی کۆئەندامی هەرس[1]




1 Ulcer

**هۆکانی پێکهاتنی برین کامانەن؟**

باکتریایەک بە ناوی هلیکۆباکتر پیلۆری هۆی سەرەکیی برینی گەدە و(دوانزەگرێ) دوازدەقامکەیە[٢]، بەڵام هۆکارەکانی دیکە بریتین لە: زێدەبوونی ئەسیدی گەدە، سترێس، هاتنەخوارەوەی هێزی بەرگریی تۆێکڵی ناوپۆشی گەدە و ڕیخۆڵە، پاش بەکارهێنانی هەندێ دەرمانی وەک ئەسپرین[٣]، ئیبۆپرۆفن[٤] و دیکڵۆفێناک[٥].

**نیشانەکانی زامی دەزگای هەرس کامانەن؟**

سەرهەڵدانی ئێش ١ تا ٢ کاتژمێر دوای نانخواردن، ئازار بە برسێتی، بە تایبەتیی لە شەودا و کەمبوونەوەی ئازار پاش نانخواردن، نیشانەی زامی دوازدەقامکەیە. سەرهەڵدانی ئازار لە کاتی نان خواردن یان لە دوای نان خواردن لەوە  دەچێ نیشانەی زامی گەدە بێ.

هەست کردن بە پڕبوونی گەدە، دڵ تێکەڵاتن، ڕشانەوە، باکردنی زگ و جاروبار کزبوون.

**دۆکتور بۆ دەسنیشانکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

دکتۆر سەبارەت بە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە پرسیار دەکا، دوای تێڕوانین، لەوەدەچێ بەر لە بەکارهێنانی هەر چەشنە ئازمایشێک(تاقی کردنەوەیەک)، دەرمان بۆ عیلاجی زامەکە بنووسێ. ئەگەر پاش ماوەیەک ئێش‌و نیشانەکانی‌تری زامەکە هەر بەردەوام مایەوە، دۆکتۆری پسپۆڕ بە یارمەتی دەزگایەک بە ناوی ئیندۆسکۆپ[٦]، تەماشای گەرو، گەدە و بەشی سەرەوەی ڕیخۆڵە باریکە دەکا و تەنانەت بۆ دەسنیشانکردنی

---

٢- بەشی سەرەتایی ڕیخۆلە باریکە

3 Aspirin
4 Ibuprofen
5 Diclofenac

٦- ژووربین(نازور)

هڵیکۆباکتر نموونەشی[٧] لێ وەردەگرێ. ئەمڕۆ بە یارمەتی تاقیکردنەوەی خوێن یان هەناسە، دەکرێ ئەم بەکتریایە دەسنیشان بکرێ.

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

لەم نەخۆشانەدا مەترسیی خوێنرێژیی، کونبوونی دیواری گەدە و دوازدەقامکە، بەرتەسکبوونی ڕێگای نێوان قوریژنک[٨]و گەدە یا گەدە و دوازدەقامکە هەیە.خوێن ڕشانەوە،ڕشانەوەی خواردەمەنی کە چەند کاتژمێر یا چەند ڕۆژ پێشترخواردراوە، ڕەشبوونی پیسایی، ئێشی کتوپڕ کە جاروبار بەرەو پشت تەشەنە دەکا، سەرگێژە و هەست بە لەرز کردن و ساردبوونی جەستە ، نیشانەی ئاڵۆزبوونی ئەم نەخۆشییەیە .

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە، لە دەرمان و هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.




---

٧- بیۆپسی

٨- سورسورک، زەنگلۆک، سورێنچک

## بەشی دووەم
## هەوکردنی گەدە[9]




### هۆکانی هەوکردنی[10] گەدە کامانەن؟

هۆکانی هەوکردنی کتوپڕی گەدە بریتین لە: خواردنەوەی لە ڕادەبەدەری ئەلکۆڵ(کحول)، بەکارهێنانی دەرمانگەلێک وەک ئەسپرینو دیکلۆفێناک، سترێس(دڵەڕاوکێ) زەبربەرکەوتنی شوێنەکە، سووتان و شۆک، هەروەها بەکتریایەک بە ناوی هلیکۆباکترپیلۆری.

بەشێک لە هۆکارەکانی هەوکردنی درێژخایەنی گەدە بریتین لە: هلیکۆباکترپیلۆری، پێکهاتنی دژەلەش[11] دژ بە بەشێک لە خانەکانی گەدە کە

---

9- Gastritis
10- Inflomation

دەبێتە هۆی کەمخوێنیی (بە هۆی نەبوونی ڤیتامین ب ١٢) و گەڕانەوەی نائاسایی زیلک بۆ ناو گەدە.

**نیشانەکانی هەوکردنی گەدە کامانەن؟**

لە هەوی کتوپڕی گەدە نیشانەگەلێک وەک: دڵتێکەڵاتن، ڕشانەوە، بێئیشتیهایی، هەست بە فشار و قورسایی لە بەشی سەرەوەی زگ دەبیندرێ.

هەوکردنی درێژخایەنی گەدە زۆر جار نیشانە یێکی تایبەتیی نیيە، بەڵام جارو بار نەخۆش هەست بە ئێش لە بەشی سەرەوەی زگ، دڵ تێکەڵاتن، باکردنی زگ یان قورسایی و پڕبوونی گەدە، هەروەها دڵەکزە دەکا.

**دکتۆر بۆ دەسنیشانکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بۆ دەسنیشانکردنی ئەم نەخۆشيیە بە یارمەتی دەزگایەک بە ناوی ئیندۆسکۆپ(نازور) تەماشای گەرو، گەدە و دوازدەقامکە دەکرێ و لەوەدەچێ بۆ ئاگاداری لە هەبوون یا نەبوونی هلیکۆباکتر نموونە بەرداریشی لێ بکرێ. ئەمڕۆ بە یارمەتی تاقیکردنەوەی خوێن، یان هەناسە دەکرێ ئەم بەکتریایە دەسنیشان بکرێ.

**ئەم نەخۆشيیە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشيیە لە دەرمان، هەروەها ڕژێمی خواردن کەڵک وەردەگیرێ.

---

١١- ئەنتیبادی (دژەتەن) Antibody ماددەیەکی تایبەتمەندی پرۆتینییە کە بە شوێن بزواندنی ماددەیەکی دەرەکی(ئەنتیچین) پێکدێ و ڕۆڵی بەرگریی بۆ جەستە هەیە. بەڵام لە نەخۆشیی خۆپارێزیی ئەم ماددەیە بە پێچەوانەوە، دژ بە خانەکانی ئاسایی جەستە پێکدێ و ڕۆڵێکی نەرێنیی دەگێڕێ.

## بەشی سێیەم
## *هەوکردنی و زامی ڕیخۆڵە گەورە*




**هەوکردن و زامی ڕیخۆڵەگەورە[12] ؟**

نەخۆشي‌یەکی درێژخایەنە کە هۆی سووربوون و ئاوسانی ڕیخۆڵەی گەورە[13] بە تایبەتیی لە بەشی ڕیخۆڵەی ڕاست دایە.[14] ئەم حاڵەتە دەتوانێ لە چەند حەفتە تا چەند ساڵ درێژەی بێ.

**هۆکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

هۆکانی ئەم نەخۆشییە نەناسراون.

---

12- Ulcerative Colitis
13- Colon
14- Rectum

**نیشانەكانی ئەم نەخۆشي‌یە كامانەن؟**



لە زۆربەی نەخۆشەكاندا زگ‌ئێشە، سكەچوونی خوێنیی تا ٣٠ جار لە ڕۆژدا بۆ ماوەی چەند هەفتە تا چەندین مانگ دەبیندرێ. بەشێك لە نەخۆشەكان تووشی ئێشی جومگەكان دەبن.

**دكتۆر بۆ دەسنیشان‌كردنی ئەم نەخۆشي‌یە چی دەكا؟**

دكتۆر سەبارەت بە نیشانەكانی ئەم نەخۆشییە پرسیار دەكا، دوای تێڕوانینی جەستە، پیسایی، نەخۆش بۆ پشكنین دەنێرێ. ڕادیۆگرافیی[١٥] لە ڕیخۆڵەكان دەكرێ، هەروەها دكتۆری پسپۆڕ بە یارمەتیی دەزگایەك بە ناوی كۆلۆسكۆپ[١٦] لە ڕێگای كۆمەوە، بە دوای تەماشای ڕیخۆڵەی گەورە، نموونەشی هەڵ دەگرێ(زەرع).

**ئاڵۆزیی‌یەكان‌و مەترسیی ئەم نەخۆشییە كامانەن؟**

نەخۆش لە كاتی  ئەم نەخۆشي‌یە بۆی هەیە تووشی خوێنرێژیی، والابوونی ڕیخۆڵەی گەورە، كونبوونی ڕیخۆڵە و تەنانەت شێرپەنجەی ڕیخۆڵە بێ.

---

15- Radiography, وێنەگرتن بە  تیشكی ئێكس

١٦- ڕیخۆلەبین.

## ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان، هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

# بەشی چوارەم
# نەخۆشیی کرۆن




### نەخۆشیی کرۆن[١٧] چییە؟

نەخۆشییەکی درێژخایەنی ڕیخۆڵەیە، بە تایبەتیی لە بەشی خوارەوەی ڕیخۆڵەی باریکەیە[١٨]. ئەم نەخۆشییە دەتوانێ تەواوی دەزگای هەرس لە دەمەوە تا کۆم تووشی ئازار و برین بکا.

### هۆکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن و چ کەسانەێک زۆرتر تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن؟

هۆکانی ئەم نەخۆشییە نەناسراون. دەکرێت هەرکەسێک تووشی ئەم نەخۆشییە ببێ، بەڵام لە ژنان، سپی پێستان و جوولەکەکاندا زۆرتر دەبیندرێ.

---

17- Crohn's disease
18- Terminal ileum

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بریتین لە قۆڵنج و ئێشی گەدە و بەشی سەرەوەی ڕاستی زگ، سکەشۆرە(سک چوون)، بوونی خوێن لە پیسایی‌دا، هاتنەخوارەوەی قورسایی جەستە، ئێشی جومگەکان و ماندوویی دەکرێ. ئەم نەخۆشانە تووشی ئازاری چاو، پێست، کەم‌خوێنیی، بەردی گورچیلە و کیسەی زیلک[١٩] بن.

**دکتۆر بۆ دەسنیشان‌کردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

دکتۆر سەبارەت بە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە پرسیار دەکا، دوای تێڕوانینی جەستە، خوێن و پیسایی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ. ڕادیۆگرافیی لە ڕیخۆڵەکان دەکرێ، هەروەها بە یارمەتیی ئیندۆسکۆپ تەماشای گەرو، گەدە و بەشی سەرەوەی ڕیخۆڵە باریکە و بە یارمەتی کۆلۆسکۆپ تەماشای ڕیخۆڵەی گەورە دەکرێ، هەروەها (زەرع)واتە نموونەشی لێ وەردەگرن.

**ئاڵۆزیی‌یەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

ئەم نەخۆشییە دەتوانێ ببێتە هۆی پێکهاتنی فیستوول[٢٠]، ئابسە[٢١]، تەنگ بوون و گیرانی ڕیخۆڵە، شێرپەنجە، هەروەها کونبوونی ڕیخۆڵە و هەوکردنی ئەو تۆێخەی کە دیواری زگ و چاڵی دیزەڵە[٢٢] دادەپۆشێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان، هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

---

١٩- زراو

20- Fistul ڕێگایەکی نائاسایی لە نێوان دوو ئەندامدا

21- Abscess, کۆبوونەوەی چڵک

٢٢- لەگەن (حەوز)

## بەشی پێنجەم

## هەوکردنی کیسەی زراو (زیلک)

### کیسەی زیلک چیی؟

کیسەی زیلک توورەکەیەکە بە درێژایی ١٢- ١٠ سانتیمەتر و پانایی ٢.٥ سانتیمەتر کە لە ژێر جەرگدایە. تراوی زیلک دوای بەرهەمهاتن لە جەرگدا، لە ڕێگای بۆڕییەکەوە بە ناوی بۆڕیی جەرگ[٢٣] ڕەوانەی کیسەی زراو دەکرێ بۆ ئەوەی دوای کۆبوونەوەی، لە کاتی پێویستدا لە ڕێگای بۆڕیی زراوبەرەوە ڕەوانەی دوازدەقامکە (بەشی سەرەتایی ڕیخۆڵە باریکە) بکرێ و لە ڕەوتی هاڕینی چەوریدا بەشداری بکا.







23- Hepatic duct

**هۆكانی هەوكردنی كیسەی زیلك[٢٤] كامانەن؟**

لەوە دەچێ بەسرانی ڕێگای زراوبەر و پەنگخواردنەوەی زراو لە كیسەی زیلكدا، هۆی هەوكردنی ئەم ئەندامە بێ. بەردی كیسەی زراو، بەردی ڕێگای زراوبەر، تومۆری شپیلك[٢٥] و بوونی كرمی ئێسكاریس لەم ڕێگایەدا، هۆی بەسران و تەنگبوونی ڕێگای ڕۆیینی زراو بەرەو ڕیخۆڵە باریكەیە.

**نیشانەكانی هەوكردنی كیسەی زیلك كامانەن ؟**

نیشانەكانی هەوكردنی كیسەی زیلك بریتین لە : ئێش لە بەشی سەرەوەی ڕاستی زگ و تەشەنەكردنی بەرەو دەفەی شانی ڕاست بە تایبەتیی دوای پشوویەكی درێژ، وەژانهاتنەوەی گەدە واتە سك چەند كاتژمێر دوای نانخواردن؛ یاو(تا)، لەرز، زەردۆیی، دڵ تێكەڵاتن، ڕشانەوە، باكردنی زگ و جارو بار خوورانی[٢٦] جەستە.

**دكتۆر بۆ دەسنیشانكردنی ئەم نەخۆشییە چی دەكا؟**

بۆ دەسنیشانكردنی ئەم نەخۆشییە دكتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشكنین دەنێرێ. لەم پشكنینەدا لەوە دەچێ ڕادەی خڕۆكە سپییەكانی خوێن و ئانزیمەكانی جەرگ زیاد بكەن. دكتۆری پسپۆڕ بە یارمەتیی دەزگای سۆنۆگرافیی تەماشای كیسەی زیلك دەكا، ئەستووربوونی دیواری كیسەی زیلك نیشانەی هەوكردنی ئەم ئەندامەیە.

**ئاڵۆزییەكان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە كامانەن؟**

ئەم نەخۆشییە دەتوانێ ببێتە هۆی كون بوونی كیسەی زیلك و پێكهاتنی ئابسە لە دەوری ئەم ئەندامە، هەروەها جەرگ و ناو زگدا، پێكهاتنی

---

24- Cholecystitis

٢٥- لەوزولمیعدە، پەنكریاس

٢٦- ئاڵۆش

فیستوول لە نێوان کیسەی زیلکو ئەندامەکانی دەوروبەری وەک دوازدەقامکە، هەروەها هەوکردنی چڵکیی کیسەی زیلک، بە تایبەتیی لە ئەو کەسانەی کە نەخۆشیی شەکرەیان هەیە. هەوکردنی درێژخایەنی کیسەی زیلک ڕادەی مەترسیی شێرپەنجەی ئەم ئەندامە زیاد دەکا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان، هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

## بەشی شەشەم
## بەردی زراو

### بەردی زیلک[27] چییە و چۆن دروووست دەبێ؟

بەردی زراولە ئاکامی وشک و ڕەقبوونی بەشێک لە تراوی زیلکە، تراوی زیلک، ماددەگەلێکی وەکو: ئاو، کۆلسترۆڵ، چەوریی، خوێ زراو، پرۆتیین و بیلیرووبین دروووست دەبێت، لەوەدەچێ زۆربوونی لە ڕادە بەدەری ئەم ماددانە هۆی پێکهاتنی بەردی زراو بێ. ئەرکی خوێ زراو لێککردنەوەێ چەوریی‌یە. بیلیرووبین سەرچاوەی زەرد و قاوەیی بوونی پیسایی‌یە.

### هۆکارەکانی بەردی زیلک کامانەن؟

- ✓ قەڵەوی (زۆربوونی لە ڕادە بەدەری چەوریی جەستە)،
- ✓ ڕەگەزی مێیینە ( لە ژناندا بەردی زیلک بە بەراورد لەگەڵ پیاواندا ٢ قات زۆرتر دەبیندرێ)،
- ✓ تەمەن ( دوای ٤٠ ساڵەی مەترسیی ئەم نەخۆشییە زیاترە)،
- ✓ بنەماڵەیی یان بۆماوەیی،
- ✓ سپی (بلۆند) بوون،
- ✓ زگپڕیی،

### نیشانەکانی بەردی زیلک کامانەن؟

قۆڵنجی زیلک: ڕۆیین و جێگۆڕینی بەردی زیلک دەتوانێ ببێتە هۆی بەسرانی ڕێگای زراو و زێدەبوونی گوشاری ناو زیلک. ئەم حاڵەتە بە تایبەتیی دوای خواردنی چێشتی چەور دەبێتە هۆی پێکهاتنی ئێشێکی کتوپڕ لە بەشی سەرەوەی ڕاستی زگ و تەشەنەکردنی بەرەو ژێر دەفەی شانی

---

27- Gallstone

ڕاست، نێوان دوو دەفەی شان و پشت. ئێش دەتوانێ لە نیو سەعاتەوە تا چەند سەعاتێک درێژەێ بێ. لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا یاو(تا)، لەرز، دڵ تێکەڵاتن، ڕشانەوە و جارو بار ئاڵۆشی جەستە ببیندرێ.

**دکتۆر بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**



**بەردی کیسەی زیلک لە سۆنۆگرافیدا**

بو دەسنیشانکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، بە یارمەتی دەزگای سۆنۆگرافی تەماشای کیسەی زیلک دەکا. لەوەدەچێ لەپشکنینی خوێنیشدا ڕادەی خڕۆکە سپیی‌یەکانی خۆێن و ئانزیمەکانی جەرگ زیاد بکا.

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

✓ بەسرانی(گیران)بۆڕیی هاوبەشی زراودەبێتە هۆی پێشگێری لە ڕۆیینی زراو بۆ ناو ڕیخۆڵە باریکەو دروستبوونی ئێشی زگ، زەردیی پێست وسپییایی چاو،

- ✓ هەوكردنی كتوپڕی كیسەی زیلك و ئالۆزییەكانی،
- ✓ هەوكردنی شپیلك،
- ✓ شێرپەنجەی كیسەی زیلك.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەكرێ؟**

بۆ چارەكردنی ئەم نەخۆشییە لە نەشتەرگەریی كەڵك وەردەگیرێ.

**بۆ پێشگیریی لە پێكهاتنی بەردی زیلك دەبێ چ بكرێ؟**

بۆ بەرگریی لە پێكهاتنی بەردی زیلك ئەم خاڵانەی خوارەوە دەبێ لە بەرچاو بگیرێ:

- ✓ دابەزاندنی قورسایی جەستە،
- ✓ جووڵان، هەڵسووڕان و بە تایبەتیی وەرزشی بەردەوام،
- ✓ كەمخواردنی چێشتی چەور.

# بەشی حەوتەم
# هەوکردنی کتوپڕی شپیلک(پەنکریاس)

## شپیلک[28] چییە؟




لووی شپیلک یان پانکراس ئەندامێکە بە درێژایی ٢٠ ـ ١٥سانتی‌مەتر، پانایی ٤ ـ ٣ سانتی‌مەتر، ئەستورایی ٣ ـ ٢ سانتی‌مەترو قورسایی ١٠٠ ـ ٧٠ گرەم. ئەم ئەندامە لە بەشی سەرەوەی زگ، لە نێوان گەدە، سپڵ و جەرگدایە.

## کاری شپیلک چییە؟

کاری لووی شپیلک بریتییە لە:

✓ درووستکردن و دەڵاندنی هۆرمۆنەکانی ئێنسۆلین، گلوکاگۆن، گاسترین و سۆماتۆستاتین بۆناو خوێن.

✓ درووستکردن و دەڵاندنی ئانزیمەکانی ئامیلاز، لیپاز، تریپسینۆژن، کیمۆتریپسینۆژن بۆ ناو دوازدەقامکە.

---

28- Pankreas, لەوزولمیعدە، شپیلک

| ئانزیم | کارتێکەریی | هۆرمۆن | کارتێکەریی |
|---|---|---|---|
| ئامیلاز[29] | بڵاوەپێکردنی نشاستە | ئێنسولین[30] | دابزاندنی شەکری خوێن |
| لیپاز[31] | بڵاوەپێکردنی چەوریی | گلوکاگۆن[32] | زێدەکردنی شەکری خوێن |
| تریپسینۆژن[33] | چەشنی ناکارایی ترپسین[34] (ترپسین لە بڵاوەپێکردنی پرۆتێن بەشداری دەکا) | گاسترین[35] | بزوێنەرە بۆ دەڵاندنی ئەسید گاستریک لە گەدە |
| کیمۆتریپسینۆژن[36] | بڵاوەپێکردنی پرۆتئێن | سۆماتۆستاتین[37] | پێشگیریی لە درووست بوون و دەڵاندنی ئینسۆلین و گلۆکاگۆن لە شیپلک دەکا |

---

29- Amylase
30- Insulin
31- lipase
32- Glucagon
33 -Trypsiogen
34- Trypsin
35- Gastrin
36- Chymotrypsinogen
37- Somatostatin

**هۆکانی سەرەکیی "هەوکردنی کتوپڕی شپیلک"[38]**

- ✓ بەردی زیلک،
- ✓ خواردنەوەی لە ڕادەبەدەری ئەلکۆڵ(کحول).

**نیشانەکانی هەوکردنی شپیلک کامانەن ؟**

- ✓ ئێشی کتوپڕ لە سەرەوەیَ زگ و تەشەنەکردنی بەرەوە پشت،
- ✓ دڵتێکەڵاتن، ڕشانەوە، باکردنی زگ،
- ✓ تا،
- ✓ لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا: کەمکردنی ئاوی لەش[39]، خوێنرێژیی، دابەزینی گوشاری خوێن، شۆک و مردن.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆپشکنین دەنێریَ بۆ تاقیگە. لەم پشکنینەدا لەوە دەچیَ ڕادەی ئامیلاز و لیپاز زیاد بکەن. دکتۆری پسپۆڕ بە یارمەتی دەزگای سۆنۆگرافیی و کۆمپیوتر تۆمۆگرافیی تەماشای شپیلک و ئاڵوگۆڕەکانی ئەم ئەندامە دەکا.

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ گیروگرفتی سییەکان،
- ✓ لە کارکەوتوویی کتوپڕی گورچیلەکان،
- ✓ خوێن بەربوون،
- ✓ دابەزینی نائاسایی ئاوی جەستە [40] و شۆک.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکریَ؟**

---

38- Acute pancreatitis
39- Dehydration
40- Hypovolemia,

- ✓ نەخۆش بۆ کۆنترۆڵی ئێش، دڵ تێکەڵاتن، ڕشانەوە و هاوسەنگیی ئاو و ئەلێکترۆلیتەکانی[٤١] جەستە لە نەخۆشخانە دەی خەوێنن.
- ✓ لە کاتی پێویستدا بۆ دەرهێنانی بەردی زیلک، کەڵک لە نەشتەرگەریی وەردەگیردرێت.

41- Electrolyte، ماددەیەکە کە لە کاتی توانەوە لە تراوێکدا، ئەلکترۆلیت بکات، دەبێتە یۆن و دەتوانێ ڕەوتی کارەبا راگوێزێ،

# بەشی هەشتەم
# هەوکردنی درێژخایەنی شپیلک




هەوکردنی درێژخایەنی شپیلک[42] دەبێتە هۆی گۆڕانکاریی بەردەوام و نەگەڕاوەی پێکهاتە و کاری ئەم ئەندامە.

## هۆکانی هەوکردنی درێژخایەنی شپیلک کامانەن؟

- ✓ خواردنەوەی لە ڕادەبەدەری ئەلکهۆڵ(کحول)،
- ✓ بەسترانی لولەی شپیلک بە هۆی بەردی زراوەوە،
- ✓ زێدە بوونی چەوریی خوێن[43] ،
- ✓ نەخۆشیی خۆپارێزیی[44]،

---

42- Chronic pancreatitis
43- Hyperlipidemia
44- Autoimmune disorders

- ✓ ئازار و زەبروێکەوتنی شپیلک.

**نیشانەکانی هەوکردنی درێژخایەنی شپیلک کامانەن؟**

- ✓ ئێش لە سەرەوەی زگ بۆ ماوەی چەند کاتژمێر تا چەند ڕۆژ. ئێش بەرەو پشت تەشەنە دەکا و پاش نانخواردن یان خواردنەوەی ئەلکۆل خەراپتر دەبێ،
- ✓ پیسایی چەور[٤٥]، سگەشۆرێ وەکو ئاکامی لاسەنگیی ڕاکێشانی چەوریی لە ڕیخۆڵەدا و بۆنێکی توند، ناخۆش و نائاسایی پیسایی،



- ✓ کزبوون.
- ✓ دڵ تێکەڵاتن و ڕشانەوە.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

---

45 Steatorrhea



بو دیاریکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ بۆ تاقیگە. لەم پشکنینەدا لەوە دەچێ ڕادەی ئامیلاز و لیپاز زیاد بکەن و ڕادەی تریپسینۆژن کەم بکا. دکتۆری پسپۆڕ بە یارمەتیی دەزگای سۆنۆگرافیی و کامپیوتر تۆمۆگرافیی و ڕادیۆگرافیی تەماشای شپیلک و ئالوگۆڕەکانی ئەم ئەندامە دەکا.

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ بەسترانی ڕێگای ڕیخۆڵە باریکە،
- ✓ لە کارکەوتنی کاری ئاسایی شپیلک[46] ،
- ✓ ئاوهێنانی نائاسایی ناو زگ[47]،
- ✓ دەڵەمەی خوێن لە خوێنهێنەرەکانی سپڵ،
- ✓ شۆک و مردن.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

- ✓ خواردنی چێشتی کەمچەوریی،

---

46- Pancreatic insufficiency, ناتەواویی شپیلک

47- Ascites

- ✓ خواردنی ڤیتامین (ئەوانەی کە لە چەورییدا دەتوێنەوە) و کالسیۆم،
- ✓ ئینسۆلین بۆ کۆنترۆڵی شەکری خوێن،
- ✓ نەخواردنی ئەلکۆڵ (کحول)
- ✓ نەشتەرگەری بۆ دەرهێنانی بەردی زیلک و تومۆر.

## بەشی نۆیەم
## هەوکردنی جەرگ[٤٨]



### جۆرەکانی هەوکردنی جەرگ(جگەر) کامەن؟

هەوی جەرگ بە هۆی دەستپێکردن و خایاندنی بە هەوی کتوپڕو درێژخایەنی جەرگ و بە پێی هۆی پێکهێنەرەکانی بە چەشنی چڵکی و ناچڵکیی دابەش دەکرێ.

### جۆرەکانی هەوکردنی چڵکی جەرگ کامانەن؟

هەوی چڵکی جەرگ بە پێی ئەو ڤایرۆسانەی کە هۆی ئەم نەخۆشییەن بە چەشنەکانی خوارەوە دابەش دەکرێ:

---

48- Hepatitis

| جۆرەکان | هۆ | هۆی تووشبوون |
| --- | --- | --- |
| هەوی جەرگ لە چەشنی A | ڤایرۆسی هەوی جەرگ لە چەشنی A | ئاو و خواردەمەنی، دەستی پیس و ئالوودە[49] |
| هەوی جەرگ لە چەشنی B | ڤایرۆسی هەوی جەرگ لە چەشنی B | گوێزرانەوە بەهۆی خوێن، پەیوەندیی جنسیی، لە دایک بۆ منداڵ، دەرزیی بە تایبەتیی لە نێو هۆگرەکان بە ماددەی سڕکەر |
| هەوی جەرگ لە چەشنی C | ڤایرۆسی هەوی جەرگ لە چەشنی C | خوێن، گوێزرانەوە لە دایک بۆ منداڵ |
| هەوی جەرگ لە چەشنی D | ڤایرۆسی هەوی جەرگ لە چەشنی D | وەک چەشنی B |
| هەوی جەرگ لە چەشنی E | ڤایرۆسی هەوی جەرگ لە چەشنی E | وەک چەشنی A |

**چەشنەکانی هەوکردنی ناچڵکیی جەرگ کامانەن؟**

- ✓ هەوکردنی جەرگ بە هۆی کاریگەریی ئەلکۆڵ(کحول)،
- ✓ هەوکردنی جەرگ بە هۆی دەوا و سەم(زەهر). بۆ نموونە وەک کارتێکەریی دەواگەلێک وەک تیتراسیکلین، دیکلوفیناک،
- ✓ هەوکردنی جەرگ وەک ئاکامی نەخۆشییەکانی دیکە، بۆ نموونە سارکۆئیدۆز[50]

---

٤٩- گیرۆدە

## نیشانەكانی هەوی جەرگ كامانەن؟



### زەردی سپیایی چاو

لە سەرەتادا نیشانەیەكی وەها لە زۆربەی نەخۆشەكاندا نابیندرێ. بەڵام نێشانەكانی خوارەوە دەتوانێ وەبەرچاو كەوێ:

داهێزراوی، بێ ئیشتیهایی، ئێشی جومگەكان، هەست بە ئێش و فشارلە بەشی سەرەوەی زگ. لە بەشێك لە نەخۆشەكاندا زەردی پێست و سپیایی چاو، خوورنی جەستە( بە هۆی زۆربوونی ئەسیدی زیلك)، ڕەشبوونی میز و سپیبوونی پیسایی دەبیندرێ.

**دكتۆر بۆ دیارییكردنی ئەم نەخۆشییە چی دەكا؟**

بو دیارییكردنی ئەم نەخۆشییە دكتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش دەنێرێ بۆ پشكنین. دكتۆری پسپۆڕ بە یارمەتی دەزگای(ئامێر) سۆنۆگرافیی تەماشای جەرگ دەكا، هەروەها نموونەش لە جەرگ هەڵدەگرێ.

---

٥٠- نەخۆشیەكی دریژخایەنی گشتییە (سیستێمێكە) كە هۆكانی نەناسراون. لە زۆربەی ئەندامەكانی جەستە گرێی زۆر ورد بە ئەندازەی شەكر یا خیز درووست دەبێ كە پێیان دەگوترێت گرانۆلۆم,Sarcoidosis .

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

ئەم نەخۆشییە بە تایبەتیی چەشنی درێژخایەنی چڵکی،دەتوانێ ببێتە هۆی شێرپەنجەی جەرگ و لەکارکەوتنی کاری ئاسایی ئەم ئەندامە.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە بە پێی هۆکانی لە دەوا(دەرمان)، هەروەها رژێمی خۆراکی بە تایبەتی وەلانانی خواردنەوەی ئەلکۆڵدار(کحولی تێدابێت) کەڵک وەردەگیرێ.

# بەشی دەیەم
## ئەپاندیسیت[٥١]




### ئەپاندیسیت چییە؟

بە هەوکردنی زێدە گۆشتی کلێنچکەی ڕیخۆڵە کوێرە[٥٢] ئەپاندیسیت دەگوترێ.

### هۆکانی ئەپاندیسیت چین؟



51 Appendicitis
52 Appendix, ئەپاندیس

**هەوکردنی زێدە گۆشتی کلینچکەی ڕیخۆڵە کوێرە**

تەنگبوون یان بەسترانی لولەی ئەپاندیس، دەبێتە هۆی چالاکبوونی بەکتریاەکانی ناو ئەم ئەندامە و لە ئاکامدا چڵککردن و هەوکردنی ئەپاندیس.

**نیشانەکانی ئەپاندیسیت کامانەن؟**

- ✓ ئێش لە سەرەتادا لە ناوەڕاستی سەرەوەی زگ و پاش چەند کاتژمێرێک لە بەشی ڕاستی خوارەوەی زگ،
- ✓ دڵ تێکەڵاتن، ڕشانەوە،
- ✓ یاو(تا)،
- ✓ بێئیشتیهایی.

**دکتۆر بۆ  دیاریی‌کردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیاریی‌کردنی ئەم نەخۆشییە، دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ و بە یارمەتی ئامێری سۆنۆگرافیی تەماشای زگ دەکا. لەوەدەچێ ڕادەی خڕۆکە سپی‌یەکانی خوێن زیاد بکاو لە کاتی سۆنۆگرافیی‌دا، تراو لە ڕیخۆڵە کوێرەدا ببیندرەێ .

**ئاڵۆزیی‌یەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ کون‌بوونی ڕیخۆڵە کوێرە و بڵاوبوونەوەی چڵک لە زگدا،
- ✓ کۆبوونەوەی چڵک،
- ✓ هەوکردنی ئەو توێخەی کە دیواری زگ و چاڵی دیزەڵە دادەپۆشێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە نەشتەرگەریی کەڵک  وەردەگیرێ.

## بەشی یازدە
## شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست




شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست[٥٣] دووهەمین شێرپەنجەی بەرچاوە دوای شێرپەنجەی سییەکان لە پیاوان و شێرپەنجەی مەمک لە ژناندا.

**هۆکان و هۆکارەکانی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست کامانەن؟**

- ✓ پۆلیپی بنەماڵەیی ڕیخۆڵەی گەورە،

53- Rectal Carcinoma




**پۆلیپی ڕیخۆڵەی ڕاست**

- ✓ هەو- زامی ڕیخۆڵە،
- ✓ زۆربوونی پرۆتیین و چەوریی ئاژەڵی لە خواردەمەنیدا،
- ✓ کەمبوونی سەوزیی و میوە لە بەرنامەی خواردەمەنیدا،
- ✓ جگەرەکێشان،
- ✓ لە تەمەنی دوای ٥٠ساڵەیدا ڕادەی مەترسیی ئەم نەخۆشییە دەچێتە سەرێ.

**نیشانەکانی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست کامانەن؟**

- ✓ بوونی خوێن لە پیسایی دا،
- ✓ گۆڕانی کتوپڕی عادەتی چوونە ئاودەست (جێگۆڕکێی قەبزیی و سگچوون)،
- ✓ هەستکردن بە ماندوویی،
- ✓ بێئیشتیهایی،
- ✓ کزبوون،
- ✓ ئاوهێنانی زگ،
- ✓ زگئێشە،
- ✓ کون بوونی ڕیخۆڵە.

## دکتۆر بۆ  دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟




**دیتنی شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست بە یارمەتی کۆڵۆسکۆپیی**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆری پسپۆڕ لە کۆڵۆسکۆپ بۆ تەماشای ڕیخۆڵە، هەروەها لە سۆنۆگرافیی، کۆمپیوتەر تۆمۆگرافیی و ڕادیۆگرافیی ڕکەیسنگ بو دیارییکردنی شێرپەنجە و بڵاوبوونەوەی سەرەتان[٥٤] لە ئەندامەکانیتری جەستەدا، کەڵکوەردەگرێ. لە یەک لە سەرسێی نەخۆشەکاندا، شێرپەنجەی ڕیخۆڵەی ڕاست لە کاتی تێروانین وەبەر قامکی دەستی دکتۆر دەکەوێ. لە بەشیک لە نەخۆشەکاندا نیشانەکانی کەمخوێنی دەبیندرێ.

## ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟

بۆچارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە کەڵک  لە نەشتەرگەری وەردەگیرێ.

---

54- Metastasis

## بەشی دوازدە

## دیڤێرتیکول، دیڤێرتیکولۆز و دیڤێرتیکولیت

مەبەست لە دیڤێرتیکول[55] پێکهاتنی کیسە یان تورەکەیەکی نائاسایی لە دیواری ئەندامێکی بۆش یان لە چەشنی لولەیە. ئەو کاتەی کە ڕادەی ئەم کیسانە لە چەند دانە زۆرتر بن، پێیان دەڵێن دیڤێرتیکولۆز[56]. بە هەوکردنی ئەم کیسانە دیڤێرتیکولیت[57] دەکوترێ.




### لە چ تەمەنێک و لە کام یەک لە ئەندامەکانی جەستە مەترسیی پێکهاتنی دیڤێرتیکول زۆرترە؟

مەترسیی درووستبوونی دیڤێرتیکول لە ٤٠ساڵیيەوەیە. ئەم حاڵەتە لە قوریژنک و ڕیخۆڵەدا زۆرتر دەبیندرێ.

---

55- Diverticulum
56- Diverticulosis
57- Diverticulitis

**هۆکانی درووستبوونی دیڤێرتیکول کامانەن؟**

بەرزبوونی گوشاری نێو ئەم ئەندامانە هۆی سەرەکیی درووستبوونی دیڤێرتیکولە. بۆ نموونە ڕەقبوونی پیسایی کە ئاکامی قەبزییەکی بەردەوامە، هۆکارە سەرەکییەکانی پێکهاتنی دیڤێرتیکولی ڕیخۆڵەیە.

**نیشانەکانی دیڤێرتیکولۆز کامانەن؟**

لە زۆربەی ئەوکەسانەدا کە تووشی دیڤێرتیکولۆز دەبن، نیشانەیەکی تایبەتیی نابیندرێ، بەڵام جارو بار نیشانەگەلێک وەکو قەبزیی، قۆڵنج و باکردنی زگ دەبیندرێ.

**نیشانەکانی هەوی دیڤێرتیکولەکانی ڕیخۆڵە کامانەن؟**

ئێش بە تایبەتیی لە بەشی چەپی خوارەوێ زگ نیشانەی سەرەکیی هەوکردنی دیڤێرتیکولە. لە کاتی چڵکردنی دیڤێرتیکولەکاندا نیشانەگەلێک وەکو یاو(تا)، دڵ تێکەڵاتن، ڕشانەوە، لەرزو قەبزی دەبیندرێن.

**نیشانەکانی دیڤێرتیکولیتی قوریژنک کامانەن؟**







لەوەدەچێ قووت نەچوونی خواردەمەنی[58]، ڕشانەوە یا گەڕانەوەێ چێشتی خواردراو بۆ ناو دەم[59]، بۆنی لە ڕادەبەدەر ناخۆشی دەم بە هۆی مانەوەی خواردەمەنی هەزمنەکراو لە قوڵکایی دیڤێرتیکولدا، لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بن.

**ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

لەم نەخۆشانەدا مەترسیی خوێنرێژی، چڵککردن، کونبوونی ئەندام، پێکهاتنی ئابسە و فیستوول هەیە.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ

---

58 Dysphagia,
59 Regurgitation




دیڤێرتیکولی ڕیخۆڵە لە کۆلۆسکۆپییدا

دیڤێرتیکولی قوریژنک لە ڕادیۆگرافییدا

بۆ تاقیگە و کەڵک لە سۆنۆگرافیی، کامپیوترتومۆگرافیی، کۆلوسکۆپیی، گاسترۆئندسکۆپیی[٦٠] و وێنەگرتن وەردەگری. لەوە دەچێ ڕادەی خڕۆکە سپییەکانی خوێن زیاد بکا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە ڕژیمی خۆراکیی، ئەنتیبیوتیک و نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

---

60- Gastroscopy, دیتنی قوریژنک، گەدە و دوازدەقامکە بە یارمەتی گەدەبین

## بەشی سێزدە

## قەبزیی



### مەبەست لە قەبزیی[٦١] چییە؟

مەبەست لە قەبزیی حاڵەتی کارنەکردنی زگی کەسێەکە کە کەمتر لە سێ جار لە هەفتەیەکدا بۆ ئاودەست بچێ. لەم حاڵەتەدا پیسایی ڕەقە و، حەرەکەتی ڕیخۆڵەکان کەم و نائاسایییە. حەرەکەتی ڕیخۆڵەکان لە حاڵەتی ئاسایی‌دا لە ٣ جار لە ڕۆژ تا ٣ جار لە هەفتەدایە.

### هۆکانی قەبزیی کامانەن؟

بەشێک لە هۆکانی قەبزیی بریتین لە:

- ✓ ڕژیمی خواردن(نەخواردنی سەوزیی، میوە، ئاو و تراوی پێویست لە ڕژیمی نان‌خواردنی ڕۆژانەدا)،
- ✓ دەواگەلیک وەک ئێش بڕەکان، ئەنتی‌دیپڕێسیۆنەکان(بۆ دەرمانی خەم و پەژارە)، باریۆم، بیسمووت و ....،

---

61- Constipation

- ✓ سکپڕی،
- ✓ کەم کاریی لووی تیرۆئید،
- ✓ کەم یان زۆربوونی کالسیۆمی خوێن،
- ✓ تەنگبوون و بەسترانی ڕیخۆڵە، وەک ئاکامی شێرپەنجەکانی ڕیخۆڵە، هەو و زامی ڕیخۆڵە و ...)




- ✓ نەخۆشیی شەکرە،
- ✓ نەخۆشیی پارکێنسیۆن،
- ✓ نەخۆشیی دەروونی وەک خەمۆکی،
- ✓ سەکتەی مێژیی (مێشک).

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم حاڵەتە چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم حاڵەتە، دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش دەنێرێ بۆ تاقیگە(بۆ ئاگاداربوون لە ڕادەێ هۆرمونی TSH، شەکری خوێن و ...) و لە سۆنۆگرافیی (بۆ دیتنەوەی دیڤێرتیکولەکان)، کۆلۆسکۆپیی (بۆ ئاگاداریی لە بەستران، تەنگیی یا هەو و زامی ڕیخۆڵە) و وێنەگرتن لە زگ کەڵک وەردەگرێ.

**قەبزیی چۆن چارە دەکرێ؟**





بۆ چارەسەرکردنی قەبزی دەبێ هۆی پێکهێنەر دەرمان بکرێ. بۆ خواردن دەبێ لە سەوزیی و میوەی زۆر؛ خواردنەوەی ئاو تا ٨ پەرداخ لە ڕۆژدا و وەرزشی بەردەوام کەڵک وەربگیرێ.

## بەشی چواردە

## زگچوون





**مەبەست لە زگچون(سکەشۆرە) چییە؟**

به پیسایی شل و ئاوەکی،دەڵێن سکەشۆرە(ئیسهال\زگچوون). ئەو کەسەی کە تووشی سکەشۆرە دەبێ، ڕۆژانە پتر لە سێ جار بۆ ئاودەست دەچێ. سکەشۆرە نەخۆشیی نییە، بەڵکو یەکێک لە نیشانەکانی نەخۆشییە.

**مەبەست لە سکەشۆرەی کتوپڕ و درێژخایەن چییە؟**

مەبەست لە سکەشۆرەی\زگچوون کتوپڕ، کاتێکە کە ئەم حاڵەتە کەمتر لە سێ حەووتو درێژەی بێ، ئەگەر زگچوونەکە پتر لە سێ حەووتو بێ، سکەشۆرەی درێژخایەنی پێ دەکوترێ.

**هۆکانی زگچوون کامانەن؟**

ڕەنگە هۆیەکەی سکەشۆرەی کتوپڕ: بەکتریا، ڤایرۆس یان پارازیت بێ، بەڵام هۆی سەرەکیی سکەشۆرەی درێژخایەن: تێکچوونی کاری ڕیخۆڵە یان هەوکردنی ئەم ئەندامەیە. (خواردەمەنیی پیس، هەوکردنی ڤایرۆسیی جەرگ، داوودەرمانی وەک ئەنتیبیوتیکەکان، نەخۆشیی کرۆن و ...).

**ئاڵۆزیییەکان و مەترسیی سکەشۆرە کامانەن؟**

کەمکردنی ئاو و ئەلکترۆلیتەکانی لەش و دابەزینی گوشاری خوێن لە ئاڵۆزیییەکانی سەرەکیی زگچونن کە بە تایبەتیی لە منداڵان و پیراندا دەتوانێ ئاکامێکی پڕ مەترسیی بۆ سلامەتی ئەوان بەدواوەبێت.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی زگچون چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم حاڵەتە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێن و پیسایی نەخۆش (بۆ دیارییکردنی میکرۆبەکان) دەنێرێ بۆ تاقیگە و لە سۆنۆگرافیی، کۆلوسکۆپیی و وێنەگرتن لە زگ کەڵک وەردەگرێ.

**سکەشۆرە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارە سەرکردنی سکەشۆرە دەبێ هۆی پێکهێنەر دەرمانبکرێ. بۆ پێشگیریی لە ئاکامەکانی کەمکردنی تراوی جەستە، خواردنەوەی ئاوی پێویست و ڕێژیمی تایبەتیی خۆاردن پێشنیار دەکرێ.

## بەشی پانزدە

## خوێن بەر بوونی کتوپڕ

## ئەندامەکانی سەرەوەی دەزگای هەرس

لەم حاڵەتەدا سەرچاوەی خوێنرێژیی، ئەندامەکانی نێوان تەسکیی سەرەوەی قوریژنک[٦٢] و کۆتایی دوازدەگرێیە.



**هۆکانی خوێنرێژیی کتوپڕی ئەندامەکانی سەرەوەی دەزگای هەزمکردن کامانەن؟**

- ✓ زامی گەدە و دوازدەگرێ،
- ✓ ڤاریسی[٦٣] قوریژنک و گەدە،
- ✓ سێندرۆمی ماڵۆری - وەیس[٦٤]،

---

62- Upper esophageal sphincter

*63*- Varicose, هەراوی و پێچخواردنی نائاسایی خوێنهێنەرەکان

64- Mallory-Weiss-Syndrome, پچڕانی تۆیخی ناوەکیی خوارەوەی قوریژنک پاش ڕشانەوەیەکی بە هێز






**ڤاریسی قوریژنک**

**نیشانەکانی خوێنرێژیی ئەندامەکانی سەرەوەی دەزگای هەزمکردن کامانەن؟**

بەشێک لە نیشانەکانی خوێنرێژیی کتوپڕی ئەندامەکانی سەرەوەی دەزگای هەزمکردن بریتین لە:

- ✓ بێهێزیی لەش،
- ✓ زگئێشە،
- ✓ ماندوویی،
- ✓ خوێن ڕشانەوە،
- ✓ سپیهەڵگەڕانی پێست،
- ✓ دڵەکوتە،
- ✓ پیسایی ڕەش،
- ✓ شۆک (ڕاچڵەکین) بە هۆی لە دەستدانی خوێن.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی خوێنرێژیی چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ بۆ تاقیگە و لە سۆنۆگرافیی، کۆلوسکۆپیی , گاسترۆئندسکۆپیی و وێنەگرتن کەڵک وەردەگرێ. پێ دەچێ ڕادەی خڕۆکە سوورەکانی خوێن، هماتۆکریت[٦٥] و هێمۆگلۆبین[٦٦] کەم بکا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بە پێی هۆی خوێنرێژیی بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان، هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

---

65- Hematocrit, لە سەدا بارستایی خڕۆکە سوورەکانی خوێنی جەستە

٦٦- Hemoglobin مادەیەکی ڕەنگیی ئۆکسیژن هەڵگرە لە خڕۆکە سوورەکانی خوێندا

# بەشی شانزە

## خوێن بەربوونی کتوپڕ

## ئەندامەکانی خوارەوەی دەزگای هەرس

لەم حاڵەتەدا سەرچاوەی خوێنرێژیی ئەندامەکانی نێوان کۆتایی دوازدەگرێ و کۆمە.

**هۆکانی خوێنرێژیی کتوپڕی ئەندامەکانی خوارەوەی دەزگای هەزمکردن کامانەن؟**






- ✓ دڤێرتیکولەکانی ڕیخۆڵە،
- ✓ هەو و زامی ڕیخۆڵەی گەورە،
- ✓ نەخۆشیی کرۆن،
- ✓ پۆلیپەکان،
- ✓ شێرپەنجەی ڕیخۆڵە.

**نیشانەکانی خوێنرێژیی ئەندامەکانی خوارەوەی دەزگای هەزمکردن کامانەن؟**

بەشێک لە نیشانەکانی خوێنرێژیی کتوپڕی ئەندامەکانی خوارەوەی دەزگای هەزمکردن بریتین لە:

- ✓ پیسایی ڕەش،
- ✓ بێهێزی لەش،
- ✓ زگ ئێشە،
- ✓ ماندوویی،
- ✓ سپیهەڵگەڕانی پێست،
- ✓ دڵەکوتە،
- ✓ شۆک بە هۆی لە دەستدانی خوێن،

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی خوێنرێژیی چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێنی نەخۆش بۆ پشکنین دەنێرێ بۆ تاقیگە و لە سۆنۆگرافیی، کۆلوسکۆپیی، گاسترۆئندسکۆپیی و وێنەگرتن کەڵکوەردەگرێ. پێدەچێ ڕادەی خڕۆکە سوورەکانی خوێن، هماتۆکریت و هێمۆگڵوبین کەم بکا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بە پێی هۆی خوێنرێژیی بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان ولە، هەروەها نەشتەرگەری کەڵکوەردەگیرێ.

## بەشی حەڤدە

## ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت






### ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت[٦٧] چییە؟

بە هەوکردنی قوریژنک، وەک ئاکامی گەڕانەوەی ئەسیدی گەدە بۆ ناو ئەم ئەندامە"ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت" دەگوترێ.

---

67- Reflux Esophagitis

### هۆکانی ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت کامانەن؟

نەبەسترانی تەسکیی خوارەوەی قوریژنک[٦٨] هۆی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەیە. چوونە سەرەوەی گوشاری ناو زگ، قەڵەویی، زۆرکێشانی جگەرە، خواردنەوەیَ لە ڕادەبەدەری ئەلکۆڵ(کحول)، شێوانی حەرەکەتی ئاسایی قوریژنک، هەروەها فیتقی دیافراگم ڕۆڵیکی بەرچاویان لەم ڕەوتەدا هەیە.

### نیشانەکانی ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت کامانەن؟





#### دڵەکزە

دڵەکزە[٦٩]، ئێشی سەردڵ، دڵ تێکەڵاتن، بە تایبەتیی لە کاتی ڕاکشان و خەوتندا، هەروەها کۆخین بە هۆی گەڕانەوەی ئەسیدی گەدە بۆ ناو قوریژنک و دەم لە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییەن.

---

68- Lower esophageal sphincter (LES)
69- Heartburn

## ئاڵۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟



**گۆڕانی نائاسایی سلوله(خانه)کانی قوریژنک  تەنگیی قوریژنک**

- ✓ خوێنرێژیی،
- ✓ تەنگیی نائاسایی قوریژنک،
- ✓ گۆڕانی نائاسایی سلوله(خانه)کانی قوریژنک[70] که پلەی پێش پێکهاتنی شێرپەنجەی قوریژنکە.

**دکتۆر بۆ  دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، لە ئندسکۆپیی، هەروەها ئەندازەگرتنی ڕادەی ئەسیدی ناو قوریژنک کەڵک وەردەگرێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەرمان، هەروەها نەشتەرگەریی کەڵک وەردەگیرێ.

---

70 Barrett's esophagus

**بۆ ئەو نەخۆشانە چ پێشنیارێک دەکرێ؟**

- ✓ گرتنی ڕژیمێکی درووستی خواردن، خۆپاڕاستن لە خواردنەوەی قاوە ،لە خواردنی شوکۆلات، لە چێشتی چەور ،لە پیواز، لە بیبەر ولە خواردنەوەی ئەلکۆل)،
- ✓ کەمخۆری، خۆاردنی کەم  لە ٥ تا ٦ ژەمدا،
- ✓ کۆنترۆڵی قورسایی جەستە،
- ✓ بەرزڕاگرتنی سەر لە کاتی خەوتندا( سەرتان لە سەر سەرین(باڵشت) بەرز دانێن)،
- ✓ لەبەرنەکردنی شەرواڵ یا دامەن(تەنورە) تەسک.

# بەشی هەژدە

## ئاشلازیا




نەکرانەوەی تەسکیی خوارەوەی قوریژنک





## ئاشلازیا[٧١] چییە؟

بە تێکچوونی حەرەکەتی ئاسایی ماسولکەی سافی قوریژنک کە دەبێتە هۆی ڕۆنەچوونی خواردەمەنی بەرەو گەدە، هەروەها نەکرانەوەی تەسکیی خوارەوەی قوریژنک (بازنەیەک لە ماسولکە لە نێوان قوریژنک و گەدەدا) ، ئاشلازیای پێدەگوترێت.

## هۆکانی ئاشلازیا کامانەن؟

هۆکانی سەرەکیی ئەم نەخۆشییە نەناسراون. بەڵام لەوەدەچێ فاکتەرگەلی چڵکی، زگماکیی یان دەزگای بەرگریی جەستە بەو چەشنە کە بە جێی بەرگری لە مرۆڤ بە شێوەیەکی نائاسایی هێرش بباتە سەر جەستەی ئەو کەسە و کاری عەسەبەکان و ماسولکەی قوریژنک تێکدا، ڕۆڵێکی بەرچاویان هەبێ لە پێکهێنانی ئەم نەخۆشییە بە تایبەتیی لە شێواندنی ئەرکی ڕێکوپێکخستنی حەرەکەتی شەپۆل ئاسای[٧٢] ماسولکەکان لە لایەن دەمار(عەسەب)ەکانیەوە. حەرەکەتی شەپۆلیی ماسولکەکان هۆی حەرەکەتی پاروی خۆاردراو لە سەرەوەی قوریژنک بەرەو گەدەیە.

## نیشانەکانی ئاشلازیا کامانەن؟

- ✓ دژواری لە خواردن و خواردنەوەدا،
- ✓ گەڕانەوەی خۆراکی هەزمنەکراوە بەرەو دەم،
- ✓ کۆخین بە هۆی گەڕانەوە و کەوتنی خۆراکی هەزمنەکراوی ناو قوریژنک بۆ ناو سییەکان،
- ✓ سنگئێشە،
- ✓ دڵەکزە.

---

71- Achalasia

72- Waves peristaltic

**ئاڵۆزییەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ دابەزینی نائاسایی قورسایی جەستە،
- ✓ سەتلوجەم (هەوکردنی سییەکان وەک ئاکامی کەوتنی خۆراکی هەزمنەکراوی ناو قوریژنک بۆ ناوسییەکان)،
- ✓ چوونەسەرەوەی مەترسیی شێرپەنجەی قوریژنک.

**دکتۆر بۆ  دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، لە وێنە گرتن لە کاتی خواردنەوەی ماددەی باریۆم[٧٣]، مانۆمێتری قوریژنک[٧٤] بۆ دیارییکردنی ڕادەی شێوانی کاری ماسولکەی قوریژنک و گاسترۆئندسکۆپیی کەڵک وەردەگری.



**وینە گرتن لە کاتی خواردنەوەی ماددەی باریۆم**




**مانۆمێتری قوریژنک**

73- Barium
74- Esophageal manometry

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بۆ چارەی ئەم نەخۆشییە لە دەوا، ئاوەلاکردنەوەی تەسکایی خوارەوەی قوریژنک بە یارمەتی باڵۆن، بڕین و جۆیکردنەوەی ماسولکەی قوریژنک[75]، لێدانی (تەزریق) سەمی بۆتۆلیۆم[76] لە ماسولکەی تەسکایی خوارەوەی قوریژنک بۆ خاوکردنەوەی ئەو ماسولکەیە کەڵک وەردەگیرێ.



75- Esophagomyotomy
76- Botulinum toxin

# بەشی نۆزدە

## باریتس ئیزۆفیێگس

### مەبەست لە باریتس ئیزۆفیێگس[77] چییە؟

مەبەست لە "باریتس ئیزۆفیێگس" گۆڕانی نائاسایی ڕەنگ و پێکهاتەی سیللوولە(خانە)کانی ماسولکەی بەشی خوارەوەی قوریژنک وەک ئاکامی کارتێکەریی درێژخایەنی ئەسیدی گەدەیە. گەڕانەوەی درێژخایەنی ئەسیدی گەدە بۆ ناو قوریژنک زۆرتر بە هۆی نەخۆشیی ڕفلاکس ئیزۆفاگیت دەبیندرێ(بڕوانە بەشی ١٧).




77 Barrett's Esophagus




**هۆکانی "بارێتس ئێزۆفێیگس" کامانەن؟**

هۆی ئەم نەخۆشییە بە وردی جارێ ڕوون نەبۆتەوە، بەڵام ئەم حاڵەتە زۆرتر لەو کەسانەی کە نەخۆشیی ڕەفلاکس ئێزۆفاگیتیان هەیە دەبیندرێ.

**نیشانەکانی "بارێتس ئێزۆفێیگس" کامانەن؟**

- ✓ دڵەکزە،
- ✓ دژواریی بۆ قووتدانی خواردەن و خواردنەوە،
- ✓ گەڕانەوەی خۆراکی هەزمنەکراوە بەرەو دەم،
- ✓ خوێنرێژی،
- ✓ بێئیشتیهای،
- ✓ دابەزینی نائاسایی کێشی جەستە.

## ئالۆزییەکان و مەترسیی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟




بارێتس ئێزۆفێیگس" ڕادەی مەترسیی شێرپەنجەی قورێژنک بە شێوەیەکی بەرچاو لە ۳۵ تا ۱۲۵ دەباتە سەر. پێشنیار دەکرێ لەو کەسانەی کە ڕەفلاکس ئێزۆفاگیتیان هەیە بە تایبەتیی لە پەنجا بەرەو ژوور ساڵێ جارێک گاسترۆسکۆپیی بکەن.

**دکتۆر بۆ دیاریی‌کردنی ئەم نەخۆشییە چی دەکا؟**

بو دیاریی‌کردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، لە وێنەگرتن لە کاتی خواردنەوەی ماددەی باریۆم، گاسترۆئندسکۆپیی و نموونەهەڵگرتن(وەزع) لە سلولەکانی قورێژنک کەڵکوەردەگری.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

ئامانجی سەرەکی لە دەرمانی ئەم نەخۆشییە پێشگری لە پێکهاتنی شێرپەنجەی قورێژنکە. دەواگەلێک وەک نێکسیووم[٧٨] و ئۆمیپرازۆل[٧٩] بۆ هێنانەخوارەوەی ئەسیدی گەدە، نەشتەرگەریی، پارێزگرتنێکی باش، کۆنترۆڵی قورسایی جەستە و وەلانانی جگەرە ڕۆڵێکی بەرچاو لە دەرمانی گەڕانەوەی ئەسیدی گەدە بۆ قورێژنک دەگێرێ.

---

78- Nexium
79- Omeprazole

## بەشی بیست
## شێرپەنجەی قورێژنک(سورێنچک)




### هۆکان و هۆکارەکانی شێرپەنجەی قوریژنک[80] کامانەن؟

لەوەدەچێ فاکتەرەکانی ژێرەوە ڕۆڵێکی بەرچاویان لە پێکهێنانی شێرپەنجەی قوریژنک هەبێ:

- ✓ خواردنەوەی لە ڕادەبەدەری ئەلکۆڵ،
- ✓ جگەرەکێشان،
- ✓ هەڵمژینی ماددەی سڕکەر،
- ✓ خواردنەوەی چای زۆر گەرم.

---

٨٠- Esophageal Cancer

- ✓ ئاشلازیای درێژخایەن (بڕوانە بەشی ١٨)،
- ✓ گەڕانەوەی بەردەوامی ترشیی (ئەسیدی) گەدە بۆ قوریژنک،
- ✓ کەمبوونی ڤیتامینەکانی **ئا، ب - ١ و س** لە ڕژیمی خۆراکییدا،

و ...

**نیشانەکانی شێرپەنجەی قوریژنک کامانەن؟**

دابەزینی بەردەوامی قورسایی جەستە لە ماوەیەکی کورتدا. دژواریی قووتدانی پارو و خواردنەوە لە نیشانەکانی سەرەتایی شێرپەنجەی قوریژنکن. هەروەها ئێش لە کاتی قووتدان دەتوانێ بەرەو سنگ و پشت تەشەنە بکا. گەڕانەوەی خۆراکی هەزمنەکراوە بەرەو دەم، دڵتێکەڵاتن و ڕشانەوەش هەروەها لەم نەخۆشانەدا دەبیندرێ.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**




**گاسترۆئندسکۆپیی**

دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دوای تێڕوانینی جەستە، لە وێنەگرتن لە کاتی خواردنەوەی ماددەی باریۆم، گاسترۆئندەسکۆپیی و نموەهەڵگرتن لە سلولەکانی قوریژنک کەڵک وەردەگرێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

بە پێ تەمەنی نەخۆش، جێی شێرپەنجە و ڕادەی بنج داکوتان و بڵاوبوونەوەی سلولەکانی سەرەتانی [81] لە جەستەدا، لە نەشتەرگەریی، شیمۆتراپیی و تیشک دەرمانی کەڵک وەردەگرترێ.

81- Metastasis

# بڕگەی (٢)

## نەخۆشیی دەزگا (کۆئەندام)ی هەناسە



## بەشی بیست و یەک
## دەزگا (کۆئەندام)ی هەناسەکێشان




***مرۆڤ لە کاتی خەو و هۆشیاریی دا بیر لە هەناسە ناکاتەوە، ئەم کارە بە شێویەکی ئاسایی و خۆکار ئەنجام دەدرێ. مرۆڤ ڕۆژانە تا ٢٠ هەزار جار هەناسە دەدات و تا ئەو کاتەی تەمەنی دەگاتە ٧٠ساڵی بەلانی کەم نزیک بە ٦٠٠ میلیۆن جارهەناسەی داوە. ئەم ڕەوتە تەنیا بە یارمەتیی دەزگا(کۆئەندام)ی هەناسەکێشان وەدی دێ.***

### دەزگا(کۆئەندام)ی هەناسەکێشان[٨٢] لە چی پیک هاتووە؟

دەزگا(کۆئەندام)ی هەناسەکێشان بریتی‌یە لەو ئەندامانەی کە لە ڕەوتی هەناسەکێشان و ئاڵوگۆڕی ئۆکسیژین و کاربۆن دیئۆکسیددا بەشداریی دەکەن. ئەم ئەندامانە بریتین لە ڕێگای هەناسە (لوت، دەم، گەروو، بۆریی و بۆریچەکانی هەناسە) و سییەکان.

82- Respiratory system

**مەبەست لە ڕەوتی ئاڵوگۆڕی ئۆکسیژین و کاربۆن دیئۆکسید چییە؟**

ئەرکی سەرەکیی دەزگا(کۆئەندامی)ی هەناسەکێشان ئاڵوگۆڕی گازەکانە. ئەم کارە تەنیا لە ڕەوتی هەناسەکێشان وەدی دێ. ئۆکسیژن لە کاتی هەڵمژینی هەوا، دوای تێپەربوون لە ڕێگای هەناسە و کیسەکانی هەوایی سییەکان، دەگاتە ناو سوڕی خوێن و هاوکات لە کاتی هەناسەدانەوە، کەربون دیئۆکسید هەر لەم ڕێگایەوە بەرەو دەرەوەی جەستە ڕەوانە دەکرێ.

**کاری کیسەی هەوا چییە؟**






تان و پۆی سیی‌یەکانی مرۆڤ پێک هاتووە لە نزیک بە ٥٠٠ میلیۆن کیسەی هەوایی‌یە[٨٣] . نزیکەی حەفتا لە سەدی ئەم کیسانە لە لایەن (موولوولەکانی خوێنەوە)مویرەگەکانەوە[٨٤] گیراوە. ئۆکسیژنی هەڵمژراو پاش گەیشتن بە ئالوویۆلەکان، دەڕێژێتە ناو مووددەمارەکان و دواتر ناو خوێنبەرەکان. هاوکات کاربۆن دی‌ئۆکسید لە ڕێگای خوێنهێنەرەکانەوە دەڕژێتە ناو ئالوویۆلەکان و لە کاتی هەناسەدانەوە هەر لەم ڕێگایەوە ڕەوانەی دەرەوەی جەستە دەکرێ.

ئالوگۆری ئوکسیژەن و کەربۆن دی ئوکسید

## بۆچی مرۆڤ پێویستی بە دەزگا (کۆئەندام)ی هەناسە هەیە؟

تەواوی ئەندامەکانی مرۆڤ بۆ زیندوومانەوە و بەجێ‌هێنانی ئەرکی خۆیان، پێویستییان بە ئۆکسیژێن و دەرکێشانی کاربۆن دی‌ئۆکسید وەک ماددەی ناپێویست لە جەستە هەیە. ئەم ئاڵوگۆڕە تەنیا بە یارمەتیی

83- Alveolus

84- Capilairy, شینەدەمار ،(مویرەگەکان)موولوولەکانی خوێن

دەزگا(کۆئەندام)ی هەناسە دەکرێ. لە نەبوونی ئۆکسیژێن‌دا، سلولی ئەندامەکان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا دەمرن.

## بەشی بیست و دوو
## هەوکردنی تان و پۆی سییەکان[85]




**هۆکانی هەوکردنی تان و پۆی سییەکان کامانەن؟**

هۆ و هۆکارەکانی سەرەکیی هەوی تان و پۆی سییەکان بریتین لە:

✓ چڵکردنی بەکترییایی (ستافیلاکۆک، پنومۆکۆک، هەمۆفیلوس ئەنفلۆوانزا و ...)،

✓ چڵکی ڤایرۆسیی (ڤایرۆسی ئەنفلۆوانزای ئا و ب، سیتامگالۆڤایرۆس و ...)،

---

85- Pneumonia



- ✓ چڵکــی کــارگیی ( کاندیــدا، کریپتۆکۆکــــوس نیوفۆرمــــانس)، پنومۆســـــیتیس کـــــارنی و میکۆ بەکتریا بە تایبەتیی لەو کەسانەی کە هێزی بەرگرِیی جەستەیان لاوازە،
- ✓ تیشــک دەرمــانیی، ســەکتەی سییەکان و ....،

**نیشانەکانی هەوی تانو پۆی سییەکان کامانەن؟**

ئەم نەخۆشییە لەو کەسانەی کە بەکتریاگەلێکی وەکو پنومۆکۆک و ستافیلاکۆک هۆکارین، بە شێوەیەکی کتوپڕ دەستپێ دەکا و نیشانەکانی خوارەوە وەبەرچاو دەکەوێ:

- یاو(تا) ،
- کۆخین،
- خڵت وچڵمی قاوەیی ـ سوور،
- هەناسەبڕکێ،
- سنگئێشە لە کاتی هەناسە کێشاندا،
- ماندوویی و لاوازیی.

ئەم نەخۆشییە لەو کەسانەی کە ڤایرۆس یان میکۆپلاسما هۆیەتی، ئارام دەست پێ دەکا و ئەم نیشانانە دەبیندرێن:

- سەرئێشە،
- ئێشی ماسولکە،
- یاو(تا)،
- کۆخەی وشک.

لەو نەخۆشانەی کە بە هۆی لژیۆنێلا[86] تووشی هەوی تان و پۆی سییەکان بوون نیشانەگەلێک وەکو: یاو(تا)، لەرز، سنگئێشە ، کۆخەی وشک، سەرئێشە، ئێشی ماسولکە و جومگە، زگ ئێشە، دڵتێکەڵاتن و ڕشانەوە وەبەرچاو دەکەون.

**ئاڵۆزییەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

لەم نەخۆشانەدا مەترسیی سپسیس، ئابسە، کۆبوونەوەی تراو یان چڵک لە تەنیشتەپەردە، ناتەواویی هەناسەیی و جوێبوونەوی دەڵەمەی خوێن لە دیواری ڕەگ و ڕۆیینی لە گەڕانی خوێندا [87] هەیە.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای پشکنینی جەستە، خوێن و بەڵغەمی نەخۆش بۆ تاقیکردنەوە دەنێرێ (لە خوێندا زۆربوونی خڕۆکە سپییەکان و CRP- c-reactives protein[88] دەبیندرێ).




**برۆنشسکۆپیی**

---

86- Legionella
87- Thromboembolie,

٨٨- پرۆتینێکە لە جەرگدا دروست دەبێ، زۆربوونی لە خوێندا نیشانەی هەو و چڵکی جەستەیە.

ڕادیۆگرافیی لە سییەکان دەکرێ، هەروەها بە یارمەتی ئامێری برۆنشسکۆپ[89] تەماشای بۆرییەکان دەکرێ و نموونەش لە سییەکان هەڵدەگرن.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

چارەسەرکردنی هەوی تان و پۆی سییەکان پێوەندیی بە هۆی پێکهێنەری نەخۆشییەکەوە هەیە. بۆ نموونە بۆ دەرمانی چەشنی بەکتریا، بە پێی ناسینی بەکتریایەکە بە یارمەتیی باکتریۆگرام، لە ئەنتیبیوتیکەکان کەڵک وەردەگیرێت.

89- Bronchoskope, بۆریچەبین

## بەشی بیست و سێ

## هەوکردنی کتوپڕی بۆریچەکانی هەناسە[90]




**هۆکانی هەوکردنی کتوپڕی بۆرییەکانی هەناسە کامانەن؟**

- چڵکی ڤایرۆسیی (لە سەدی ۹۰) وەکو ئادنۆڤایرۆس، کۆکساکی ڤایرۆس، ڕینوڤایرۆس،
- چڵکی بەکتریایایی: ستافیلاکۆک، پنومۆکۆک، همۆفیلۆس،
- چڵکی کارگیی،
- گاز(بۆ نموونە ئامۆنیاک)، تەپوتۆز،
- سورێژە، کۆخەرەشە.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ ئێشی دەست و لاق،
- ✓ پژمین،
- ✓ یاو(تا)،

90- Acute bronchitis

- ✓ قرچانەوە(کزانەوە)ی چاو،
- ✓ ئێشی ماسولکە و جومگەکان،
- ✓ سەرئێشە،
- ✓ گەروئێشە و دژواری لە خواردن و خواردنەوە،
- ✓ بەڵغەمی چڵکیی.

**ئاڵۆزییەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- ✓ برۆنشۆپنومۆنی(هەوی هاوکاتی بۆرییەکانی هەناسە و سییەکان)،
- ✓ خەراپترکردنی نیشانەی نەخۆشییەکانیتر وەک گیروگرفتی دڵ و هەناسەیی.



**دکتۆر بۆ دیاریکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

بۆ دیاریکردنی ئەم نەخۆشییە دکتۆر دوای تێڕوانینی جەستە، خوێن و خڵتەی نەخۆش بۆ تاقیکردنەوە دەنێرێ (زۆربوونی خڕۆکە سپییەکان لە حاڵەتی باکتریایی و کەمبوونی خڕۆکە سپییەکان و زۆربوونی لنفۆسیتەکان لە حاڵەتی ڤایرۆسیی لە خوێندا دەبیندرێن). ڕادیۆگرافیی لە سییەکانیش دەکرێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارە دەکرێ؟**

ئامانجی سەرەکیی، چارەسەرکردنی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییەیە:

- پشوودان،
- تاو ئازارشکێن وەک ئەسپرین و پاراسیتامۆڵ،
- دەرمانی کۆخە (کۆخەبڕ) وەکو پاراکۆدئین،
- دەرمانی خڵتە،
- ئەنتیبیوتیک لە حاڵەتی بەکتریایایی بوونی ئەم نەخۆشییەدا،
- ئەنتیڤایرۆسەکان وەکو ئامانتادین[٩١] لە حاڵەتی ڤایرۆسیبوونی ئەم نەخۆشییەدا.

*91*- Amantadine

## بەشی بیست و چوار
## هەوکردنی درێژخایەنی بۆرییەکانی هەناسە




بە پێی لێکدانەوەی ڕێکخراوی تەندرووستی جیهانی، بەو حاڵەتەی کە نەخۆش لە ماوەی ٢ ساڵدا و هەموو ساڵ بەلانی کەم سێ مانگ تووشی کۆخین و خڵتهێنانەوە بێ، هەوی درێژخایەنی بۆریچەکانی هەناسە[٩٢] دەگوترێ. لەم نەخۆشانەدا بۆرییەکان تووشی هەو و ئاوسانی نەگۆڕ و بەردەوام دەبن.

**هۆکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- جگەرەکێشان (لەسەدا نەوەدی هۆی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەیە)،
- تەپوتۆز و پیسبوونی هەوای دەوروبەر،
- چڵکی دەزگا(کۆئەندامی)ی هەناسە،

92- Chronic bronchitis

- گازە ژەهرییەکان.

**نیشانەکان هەوکردنی درێژخایەنی بۆرییەکانی هەناسە کامانەن؟**

- کۆخین،
- خڵتە،
- هەناسە بڕکێ،
- بۆربوونەوەی رەنگی پێست[٩٣]،
- چونەسەرێی قورسایی جەستە.

**ئاڵۆزییەکانی هەوکردنی درێژخایەنی بۆرییەکانی هەناسە کامانەن؟**

- هەوی هاوکاتی بۆرییەکانی هەناسە وتان و پۆی سییەکان،
- هەوی چڵکیی ڕێگای هەناسە،
- ئاوسانی سییەکان.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

- ڕادیۆگرافیی (لە نەبوونی ئالۆزییدا نیشانەیەکی تایبەتمەند نابیندرێ)،
- چاندنی خڵتە و ئەنتیبیۆگرام بۆ دیارییکردنی هۆیەکان و دەسنیشانکردنی چەشنی دەرمان،
- برۆنشسکۆپیی و نموونەهەڵگرتن،




93- Cyanosis

- هەڵسەنگاندنی کار و فونکسیۆنی سییەکان.
- تاقیکردنەوەی خوێن (لە کاتی ڤایرۆسییبوونی ئەم نەخۆشییەدا، ڕادەی خڕۆکە سپییەکان کەم دەکا و لنفوسیتەکان زۆر دەبن، بە پێچەوانە لە کاتی بەکتریایی بووندا ڕادەی خڕۆکە سپییەکان زۆر دەکا) و گازەکانی خوێنی خوێنبەرەکان(هاتنە خوارێ ٢ Po و زۆربوونی ٢ CO) لە کاتی ناتەواویی هەناسەییدا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەرمان دەکرێ؟**

- وەلانانی جگەرە،
- دەرمانی سەرچاوەی چڵک ( بۆ وەێنە هەوی درێژخایەنی سینوسەکان[٩٤])،
- ئەنتیبیوتیک بە پێی دەسنیشانکردنی باکتریاوهەوکردنی سییەکان،
- دەوای دژەڤایرۆس بە پێی دەسنیشانکردنی هۆی ڤایرۆسی،
- ڕاهێنانی ماسولکەکانی هەناسەیی(ژیمناستیکی هەوا)،
- برۆنشۆدلیاتۆر[٩٥] بۆ والاکردنی بۆرییەکان و کردنەوەی ڕێگای هەناسەکێشان،
- گلیکۆکۆرتیکۆئید (هۆرمۆن بۆ کەم کردنەوەی هەوکردنی ڕێگای هەناسە)،
- ئۆکسیژێنتراپی[٩٦] لە کاتی هەناسەبڕکێ سەختدا.

---

94- Sinusitis

95- Bronchodilator ئەو دەواگەلەی کە کاریان والاکردنی بۆرییەکانی هەناسەیە

٩٦- پێدانی ئۆکسیژێن.

# بەشی بیست پێنج
# ئیمفیزێم




بە والابوونی نەگۆڕی کیسەکانی هەوایی سییەکان وەک ئاکامی تێک چوون و خەراپبوونی دیواری بەینیان ئیمفیزێم[٩٧] دەگوترێ.

**هۆکانی ئیمفیزێم کامانەن؟**



جگەرەکێشانو کەمبوونی ئالفا یەک ئەنتیترپپسین[٩٨] هۆی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەن.

---

97 Emphysema

## نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟

لەم نەخۆشانەدا بە پێ ڕادەی پێشچوونی نەخۆشییەکە نیشانەکانی خوارەوە دەبیندرێن:

- هەناسە بڕکێ،
- لە کاتی پەرەگرتوویی نەخۆشییەکەدا:

**چەشنی ئا**

- ✓ هەناسە بڕکێ ی سەخت، تەنانەت لە کاتی پشوودانیدا،
- ✓ خڵتی کەم،
- ✓ زەردبوونی ڕەنگی پێست.

**چەشنی ب**

- ✓ هەناسە بڕکێ لە کاتی کار و پیاسەکردندا،
- ✓ خڵتی زۆر،
- ✓ کۆخەیەکی زۆرو بەردەوام،
- ✓ بۆربوونەوەی رەنگی پێست.

**دکتۆر بۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

- تاقیکردنی خوێن،
- تاقیکردنی فونکسیۆنی سییەکان بە یارمەتی سپیرۆمتریی[٩٩]

---

٩٨- ئالفا یەک ئەنتیتریپسین، گلیکۆپرۆتێینیەکە، کە لە جەرگدا بەرهەم دێ و رۆڵیکی گرنگی هەیە لە بەرگریی تانی سییەکان لە کارتێکەریی وێرانکەری بەشێک لە ئەنزیمەکان و سلولەکانی هەوپێکهێنەر. Alpha 1-antitrypsin

99- Spirometry




- ڕادیۆگرافی
- کۆمپیوتەر

**ئەم نەخۆشییە چ**

- پێدانی Prolastin لە کاتی نەبوون یا کەمبوونی ئالفا یەک ئەنتیتریپسین‌دا، یەک جار لە یەک یا ٢ هەفتەدا
- پێدانی ئۆکسیژێن،
- چاندنی سییەکان.

## بەشی بیست و شەش
## ئاسم(هەناسە تەنگی)



ئاسم[100] هەو و نەخۆشییەکی درێژخایەنی ڕێگای هەناسەیە. نەخۆش بە هۆی هەستیاریی نائاسایی و تەنگبوونی بۆرییەکانی هەناسە تووشی هەناسە بڕکێی کتوپڕ، بەڵام گەڕاوە دەبێ.

**هۆکانی ئاسم کامانەن؟**

- ئالێرژی(حەساسیەت)،
- چڵکی دەزگای(کۆئەندام) هەناسە،
- دەوا وەکو ئەسپرین،
- کارتێکەریی ماددەی ژەهراوی یان کیمیایی،
- نەخۆشیی ڕەفلاکس ئێزۆفاگیت (بڕگەی یەک، بەشی ١٧).
- چالاکیی فیزیکیی

100- Asthma

**نیشانەکانی ئاسم کامانەن؟**

نیشانەکانی ئاسم کاتێک بەرچاو دەکەون کە تۆیخی ڕێگای هەناسە بە پێی کارتیکەریی ئالێرژەنەکان [١٠١] یا بزوێنەکانیتر تووشی ماسین و تەنگ بوونەوە بن. هەو و ماسینی تۆیخی بۆرییەکانی هەناسە دەبێتە هۆی پێکهاتنی نائاسایی و زۆری خڵت و تەنگبوونی ڕێگای هەناسە، تەنانەت بەسترانی ئەم ڕێگایە و سەرهەڵدانی هێرشی کتوپڕی ئاسم. ئەم نیشانانە بریتین لە:

- هەناسەبڕکێی کتوپڕ،
- کۆخەی بەردەوام بە تایبەتیی شەوانە یا سەر لە بەیانی،
- خڵتەی بێڕەنگ ( بەڵام لە کاتی چڵکییدا قاوەیی یان سەوزە)
- سیخەی سنگ،
- خێرالێدانی نائاسایی دڵ،
- زێدەبوونی فشاری خوێن لە کاتی هێرشی کتوپڕ و هەناسەبڕکێی سەخت،
- هەست بە ئێش یان فشار لە ڕکەی سنگدا.

**دکتۆربۆ دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

دکتۆر سەبارەت بە نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە پرسیار دەکا و لە شێوەکانی خوارێ بۆ دیارییکردنی ئاسم کەڵک وەردەگرێ:

- تێراونینی سییەکان (بیستنی سیخەی سنگ و درێژبوونی کاتی هەناسەدانەوە بە بەراورد لەگەڵ کاتی هەناسە کێشان)،،
- تاقیکردنەوەی فونکسیۆنی سییەکان بۆ دیارییکردنی تەنگیی بۆرییەکانی هەناسە،

---

101 هەستەوەرەکان، ئەومادانەی کە هۆی زۆربوونی هەستیاری مرۆڤن



Using an inhaler

- تاقیکردنەوەی هەستیاری بۆرییەکانی هەناسە، بۆ نموونە بە یارمەتیی هیستامین،
- تاقیکردنەوەی خوێن،
- تێستی ئالێرژی بۆ دیاریی‌کردنی ئەو ماددەیەی کە هۆی هەستیاریی بۆرییەکانی هەناسەیە،
- وێنەگرتنی سیی‌یەکان،
- چاندنی خڵت.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

ئاسم نەخۆشیی‌یەکی درێژخایەنە و بە تەواوی دەرمان ناکرێ. ئامانجی سەرەکیی دەواو دەرمان کۆنترۆڵی ئەم نەخۆشییەیە. بەم مەبەستە دەواکانی دیاریکراوی ژێرەوە بە نەخۆش دەدرێ:

- دەوا بۆ والاکردنەوەی بۆریچەکانی هەناسە و کردنەوەی ڕێگای هەناسە (وەکو سالمێتێرۆل[١٠٢]، تیوفیلین[١٠٣] و ... )،
- هەڵمژینی کۆرتیکۆستروێید بۆ کەمکردنەوەی هەو، ماسین و ڕادەی هەستیاریی جەستە،
- دەوا بۆ کەمکردنەوەی خەستیی خڵتە یان بەڵغەم،
- دەرمانی ئالێرژی (بۆ نموونە لە ڕێگای ئیمونۆتراپیی‌یەوە).

**ڕێگای پێشگیری لە ئاسم چییە؟**

- خۆپاراستن لەو شتانەی کە بزوێنەری هەستیاریی نەخۆشن،
- خواردن و هەڵمژینی ئەو دەوایانەی کە دکتۆر بۆ نەخۆشی نووسیوە.

---

102 Salmeterol
103 Theophylline

## بەشی بیست و حەوت
## هەوی تەنیشتەپەردە[١٠٤]

### تەنیشتەپەردە چییە؟







تەنیشتەپەردە کیسەیەکە کە سییەکان دادەپۆشی و لە دوو چین پێکهاتووە. بەو چینەی کە سییەکان دادەپۆشی تەنیشتە پەردەی سیپەلک[١٠٥] و بەو چینەی کە دیواری رکەی سنگ دادەپۆشێ، تەنیشتە پەردەی دیوارەیی[١٠٦] دەکوترێ. لە نێوان ئەم دوو چینەدا، تویێژێکی ناسکی تراو هەیە کەرێگری لە یەکخشانی نیان دەکات.

### هۆکانی هەوکردنی تەنیشتە پەردە کامانەن؟

* هەوکردنی سییەکان (وەک هەوی تان و پۆی سییەکان)،
* جەڵتەی سییەکان،
* ڤایرۆسەکان وەک ڤایرۆسی ئەنفلۆونزا،
* سیلی سییەکان،
* وەک ئاکامی نەخۆشیی ئەندامەکانی سەرەوەی دەزگا(کۆئەندام)ی هەزم کردن،

---

104 Pleuritis (Pleurisy)
105 Visceral pleura or pulmonary pleura
106 parietal pleura

* شێرپەنجەی سییەکان و ئەندامەکانیتر وەکو شپیلک و هێلکەدان (تۆودان).

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- سنگئێشە لە کاتی هەناسەکێشاندا،
- کۆخەی وشک،
- پشووسواریی،
- یاو(تا) (ئەگەر هۆی ئەم نەخۆشییە بەکتریا بێ).

**ئەم نەخۆشییە چۆن دیاری دەکرێ؟**

لەوە دەچێ دکتۆر بە پێی نیشانەکان و گوێدان بە نیخەی سنگ، ئەم نەخۆشییە دیاری بکا. لە کاتی گوێدان بە نیخەیسنگ دەنگێک وەک سیرەی بەفر لە ژێر پێدا دەبیستری. هەروەها دکتۆر دەتوانێ لە وێنەگرتن (بۆ دیارییکردنی هەوی تانو پۆی سییەکان یا سیلی سییەکان)، پشکنینی خوێن (زۆربوونی خڕۆکە سپییەکان یان نیشانەکانی شێرپەنجە لە خوێندا وەکو CA ۱۹-۹ لە شێرپەنجەی شپیلک وCA-۱۲۵ لە شێرپەنجەی تۆودان دا) کەڵک وەرگرێ.

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارەدەکرێ؟**

ئامانجی سەرەکیی، چارەسەرکردنی هۆی پێکهێنەری ئەم نەخۆشییەیە (بۆ نموونە بەکاربردنی ئەنتیبیوتیک لە کاتی باکتریایی بوونی هۆی نەخۆشییەکەدا) لە ناوبردنی نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بە کەڵکوەرگرتن لە دەواکانی ئازارشکێن و دژی هەو وەکو ئیبۆپرۆفن یان ئەسپرینە.

## بەشی بیست و هەشت

## شێرپەنجەی سییەکان




### مەبەست لە شێرپەنجەی سییەکان[١٠٧] چییە؟

مەبەست لە شێرپەنجەی سییە، زۆربوونی سەربەخۆ و کۆنترۆڵ نەکراوی گەردیلەکانی (سلولەکانی) تان و پۆی سییەکانە. ئەم شێرپەنجە لە پیاواندا بە ڕێژەی لەسەدا ٣٢ دەبێتە هۆی مردن و لە ژناندا بەرێژەی لەسەدا ٢٠ ـ ە. شێرپەنجەی سییەکان زۆرتر لە تەمەنی ٥٥ تا ٦٠ساڵدا دەبیندرێ.

### چەشنەکانی شێرپەنجەی سییەکان کامانەن؟

- شێرپەنجەی سلولە بچووکەکان[١٠٨] (زورتر لە ڕێگای هەناسەدا دەبیندرێ)،
- شێرپەنجەی سلولە نابچووکەکان[١٠٩].

107 Lung cancer
108 Small cell lung cancer
109 Non-small cell lung cancer

**هۆكانی شێرپەنجەی سیی‌یەكان كامانەن؟**

- جگەرەكێشان (سەدا نەوەدی شێرپەنجەی سیی‌یەكانی پیاوانو سەداحەفتای شێرپەنجەی سیی‌یەكانی ژنان)،
- لە ژێر كارتیكەریی گازی ڕادۆن و لۆكەی ئاورنەگر(نەسوز بوون،
- ڤایرۆسەكان بو وێنە: پاپیلۆماڤیرۆسی ئینسانی[١١٠]، سیتۆمگالۆڤایرۆس[١١١]،
- جیٚبرین لە سیی‌یەكاندا،
- بواری ژنێتیكیی(چینی) (بوونی شێرپەنجە لە دایک و باوک تا ٣ قات مەترسیی شێرپەنجە لە منداڵەكاندا زۆرتر دەكا)

**نیشانەكانی شێرپەنجەی سیی‌یەكان كامانەن؟**

- كۆخەی بەردەوام كە كوتایی نایەت،
- كۆخەی خوێناویی،
- دابەزینی بەردەوامی قورسایی جەستە،
- بیٚئیشتیهایی،
- گۆڕانی دەنگ،
- ماندوویی و لاوازیی،
- پشووسواریی و سیخەی سنگ،
- ئاوسانی دەم و چاو و مل.
- زوو بە زوو تووشی  هەوی تان و پۆی سیی‌یەكان و هەوی ڕێگای هەناسە بوون.

**دكتۆر بۆ دیاریی‌كردنی ئەم نەخۆشییە چ دەكا؟**

- وێنەگرتن لە سیی‌یەكان.

---

110 Human papillomavirus
111 Cytomegalovirus

- برۆنشسكۆپیی[١١٢].
- کۆمپیوتەر تۆمۆگرافیی.




- نموونەوەرگرتن لە تان و پۆی سییەکان و تاقیکردنەوەی بۆ دیاریکردنی خانەشێرپەنجەییەکان
- تاقیکردنەوی خڵت بۆ دیارییکردنی سلولەکانی سەرەتانیی،
- دیارییکردنی مارکێرەکانی[١١٣] سەرەتانی وەکو: NSE ,SCC ,CYFRA CEA ،

**ئەم نەخۆشییە چۆن چارەسەردەکرێ؟**

بە پێ پەرەسەندنی شێرپەنجە لە سییەکان و ئەندامەکانیتر، نەخۆش بە نەشتەرگەریی، تیشک دەرمانیی، شیموتراپیی(دەرزی کیمیای) (بەکارهێنانی دەوا) چارە دەکرێ.

---

١١٢- دیتنی ناو بۆرییەکانی هەوا بە یارمەتی بۆریی بین.

113 Marker

## بەشی بیست و نۆ
## کار و قەبارەی دڵ




### دڵ چییە؟

دڵ ئەندامێکی ماسولکەیی نێوبەتاڵە کە لە ناو ڕکەی سنگ، لە نێوان هەر دوو سییەکان جێگیرە. دیواری دڵ لە سێ چین درووست بووە:

- ماسولکەی دڵ (میۆکارد)[١١٤]
- ناوپۆشی دڵ (ئیندۆکارد)[١١٥]
- ڕووپۆشی دڵ (ئیپیکارد)[١١٦]

ڕووپۆشی دڵ چینی ناوەکی تویخێکی دوو چین بە ناوی دڵپۆشە (پریکارد)[١١٧] .نزیک بە ٥٠ میلیلیتر شلەیدڵپۆش[١١٨] پێشگیریی لە لێکخشانی دوو چینی ئەم تۆیخە دەکا. دڵ ٤ دیو[١١٩] و ٤ دەریچە[١٢٠] لە خۆی دەگرێ و

114 Myocardium
115 Endocardium
116 Epicardium
117 Pericardium
118 Pericardial fluid
119 Chamber

به هۆی دیواری ناوەڕاستەوە[١٢١] بە دوو بەشی ڕاست و چەپ دابەش دەکرێ. لە هەر بەشدا، دوو دیو و دوو دەریچە دەبیندرێن. بە دیوەکانی سەرەوەی دڵ دالان[١٢٢] و بە دیوەکانی خوارێ سکۆڵە[١٢٣] دەڵێن. دەریچەی سێپەڕە یان تریکۆسپید[١٢٤] لە نێوان دوو دیوی لای ڕاستە و دەریچەی مەترال[١٢٥] یان دووپەڕە لە بەینی دوو دیوی لای چەپە. دوو دەریچەی دیکە لە نێوان دوو خوێنبەری سەرەکیی دڵ و دیوەکانی سکۆڵەی چەپ و ڕاستن.




120 Valve
121 Septum
122 Atrium, ئاتریوم
123 Ventricle, ڤێنتریکل، زگۆڵە
124 Tricuspide valve
125 Mitral valve

دەریچەی سیپەلک[١٢٦] لە نێوان سکۆڵەی ڕاست و خوێنبەری سیپەلکیی[١٢٧] و دەریچەی ئائۆرت[١٢٨] لە نێوان سکۆڵەی چەپ و ئائۆرتە. لە ئائۆرتەوە دوو خوێنبەری ڕاست و چەپی تاجیی[١٢٩] پاش جیابوونەوە ڕەوانەی دڵ دەبن، لە پشتی دڵ یەک دەگرنەوە.

**کاری سەرەکیی دڵ چییە؟**

کاری دڵ وەکو ترومپایەک ڕەوانە کردنی خوێن بەرەوە تان و پۆکانی جەستەە. پاش هەر لێدانێکی دڵ، خوێن لە لای چەپی دڵەوە دەڕژێتە ناو گەورە دەماری"ئائۆرت"و لەوێشەوە لە ڕێگای خوێنبەرەکانەوە[١٣٠] دەگاتە ئەندامەکانی دیکەی جەستە و ئۆکسیژێنیان پێ دەگەیەنێ. ڕێژەی ئاسایی لێدانی دڵ لە نێوان ٦٠ تا ١٠٠ کەڕەت لە خولەکێکدایە.

**مەبەست لە سیستۆلە و دیاستۆلەی دڵ چییە؟**

بە گرژبوونەوەی دڵ و بە تایبەتیی گرژبوونی سکۆڵەکان "**سیستۆلە"ی**[١٣١] دڵ دەکوترێ. مەبەست لە "**دیاستۆلە"ی**[١٣٢] دڵ ڕەوتی خاوبوونەوەی دڵە.

**میکانیزمی گرژبوونی ماسولکەی دڵ چییە؟**

هۆی سەرەکیی گرژبوونی دڵ ڕەوتێکی ئەلکتریکی‌یە[١٣٣] کە لە گرێی سینوسیی[١٣٤] ناو ماسولکەی دالانی دڵ بەرهەم دێ. ئەم ڕەوتە لە ڕێگای

---

126 Pulmonary valve
127 Pulmonary artery
128Aortic valve
129 Coronary artery, خوێنبەری کرۆنێریی
130 Arteries
131 Systole
132 Diastole
133 Electric current
134 Sinus node

ڕیشاڵەکانەوە[135] کە وەک کێبلێکی ئەلکتریکین[136] ڕەوانەی گرێی دالان - سکۆڵە[137] دەکرێ و دەبێتە هۆی گرژبوونی سکۆڵە، لێدانی دڵ و پۆمپاژی خوێن.




**وێنەی ڕەوتی ئەلکتریکیی دڵ**

---

135 Fibers
136 Electrical Cable
137 Atrio–ventricular node

**خوێن لە چ ڕێگایەکەوە دەگاتە دڵ؟**

خوێن لە ڕێگای خوێنبەرەکانی تاجییەوە (کرۆنێریی)[١٣٨] دەگاتە ماسولکەی دڵ.




138 Cornary artery

## بەشی سی
## ئانژینا پێکتۆریس
## و
## نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ




### مەبەست لە ئانژینا پێکتۆریس[139] چییە؟

مەبەست لە ئانژینا پێکتۆریس، سنگ ئێشەیە. ئانژین یان "ئێش" سەرەکیی‌ترین نیشانەی نەخوشیی کرۆنێریی دڵە[140] کە لە کاتی وەرزش، کاری قورس، زۆرخۆریو گوشاری ڕۆحی لە نێوەوەی ڕکەی سنگدا هەستی پێدەکرێ.

### هۆی سەرەکیی سنگ ئێشە چییە؟

لاسەنگیی نێوان گەیشتنی ئۆکسیژن بە ماسولکەی دڵ و نیاز و پێویستیی کاری دڵ بە ئۆکسیژن هۆی سەرەکیی سنگ ئێشەیە.

---

139 Angina Pectoris
140 Heart Coronary Disease




### نەخۆشیی کرۆنیریی دڵ چییە؟

مەبەست لە نەخۆشیی خوێنبەری کرۆنێریی تەنگبوونەوەی ئەم خوێنبەرانەیە بە هۆی ئاتێرۆسکلێرۆز[١٤١]. ئەم حاڵەتە دەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ڕەوتی خوێن بۆ دڵ و کەمخوێنیی دڵ.

### کاری خوێنبەرەکانی کرۆنێریی دڵ چییە؟

خوێن لە ڕێگای خوێنبەرەکانی کرۆنێرییەوە (تاجیی)**دەگاتە** ماسولکەی دڵ .

### هۆکارەکانی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ کامانەن؟

- بەرزبوونی گوشاری خوێن.
- نەخۆشی شەکرە.
- زیادبوونی چەوریی خوێن.
- فاکتەری بنەماڵەیی یان بۆماوەیی.
- جگەرەکێشان.

---

141 Atherosclerosis, ڕەق و ئەستووربوونی دیواری خوێنبەرە

- چوونەسەریی تەمەن( پیاوان دوای ٤٥ ساڵ و ژنان دوای ٥٥ ساڵ).
- ڕەگەزی نێرینە.
- قەڵەوی - ئەو کاتەی کە قورسایی جەستە لە سە دی ٣٠ ی بنەما تێپەڕێ.
- داتەپیویی (تەبەڵی).
- خەمۆکی.
- خواردنی چەوری.
- ژنان دوای عوزرنەشۆشتن( یائسەگی) بەهۆی کەمبوونەوەی هۆرمۆنی ژنانەی ئسترۆژێن.
- کەڵک وەرگرتن لە کۆکائین.

**نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ چ نیشانەگەلێکی هەیە؟**

- سەرهەڵدانی ئێش لە لای چەپ و یان نێوەڕاستی چەڵەمەی سنگ لەکاتی کار یان نائارامیدا[١٤٢]. بەردەوامیی ئێش لەچەند خولەکەوە تا ٣٠ خولەک دەخایەنێ و بە پشوودان و یان چەژتنی نیترۆگلیسیرین کۆتایی پێ دێ.
- ئێش بەرەو مل، دەست و دەفەی شانی چەپ دەکێشرێ و لە کە سانێکدا پشووسواریی، ئارەقەکردن، سەرئێشە و دڵ تێکەڵی دەهێنێ
- جاروبار پشووسواریی تەنیا نیشانەی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵە.
- لە بەشێک لە نەخۆشەکاندا هیچ نیشانەیک نابیندرەێ.

---

142 Stress

**نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ چۆن دیاریی‌دەکرێ؟**

ئەم نەخۆشییە بە پێی نیشانەکان، گۆڕانکارییەکانی هێڵکاری دڵ و چوونەسەرەی ڕادەی ئانزیمەکانی دڵ لە خوێندا دەسنیشان‌دەکرێ.

**نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ چۆن چارەسەرکردن دەکرێ؟**

چارەسەرکردنی نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ گرێدراوە بە ڕادەی بەسرانی خوێنبەرەکانی کرۆنێریی و هۆکارەکانی پێکهاتنی گرفتەکەیە، کە لە ئاکامدا بە نەشتەرگەری چارە دەکرێ. ئامانجی سەرەکی لە بەکارهێنانی دەوا بە چەشنی خوارەوەیە:

- بەکارهێنانی ئەو دەرواتانە کە دەبنە هۆی کرانەوەی خوێنبەری کرۆنێریی دڵ و بەرزکردنەوەی ڕەوتی گەیاندنی ئۆکسیژنی پێویست بە دڵ، بۆ نمونە نیترۆگڵیسیرین[١٤٣] .
- بەکارهێنانی ئەو دەرواتانە کە دەبنە هۆی کەمکردنەوەی پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژن لە ڕێگای کەمکردنەوەی کاری دڵ، بۆ وێنە بیزۆپرۆلۆل[١٤٤].
- گەیاندنی ئۆکسیژنی پێویست بە دڵ، یان هێنانەخوارێی پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژن، بۆنمونە وراپامێل.[١٤٥]
- بەکارهێنانی ئەو دەرواتانە کە دەبنە هۆی بەرینکردنەوەی ڕەگی خوێنبەر، گەیاندنی خوێن بە دڵ. کەمکردنەوەی فشاری خوێن و هێنانە خوارێی ڕێژەی مردنی نەخۆش، وەکو ڕامیپریل. [١٤٦]

---

143 Nitroglycerin
144 Bisoprolol
145 Verapamil
146 Ramipril

- **نەشتەرگەریی بای پەسی دڵ**[147] بۆ ئەو کەسانەی کە:
  - ✓ لەسەدی ٥٠ی خوێنبەری سەرەکیی لای چەپی دڵیان بەسترابێ.
  - ✓ نەخوشیی ٣ ڕەگیان بێ ( پتر لەسەتا ٧٠ی بەسترابێ).
  - ✓ لە پێوەندی لە گەڵ هاتنەخوارێی کاری بەشی چەپی دڵدا بن.
  - ✓ بە تازەیی تووشی جەڵتە (سەکتە)ی دڵ بووبن.
  - ✓ سەرەڕای بەکارهێنانی دەوا(دەرمان) لە حاڵەتی پشووداندا ئێشی بەردەوامی دڵیان بێ.

**بۆ پێشگیری لە نەخۆشیی کرۆنێریی دڵ پێویستە چ بکرێ؟**

پێش هەموو شتێک دەبێ هۆکارەکانی کۆنترۆڵ بکرێ. پێشنیار دەکرێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەرچاو بگیرێ:

- نەکێشانی جگەرە.
- وەرزشی بەردەوام بۆماوەی نیو کاتژمێر، چوار جار لە هەفتەدا).
- دابەزاندنی قورسایی جەستە.
- کۆنترۆڵی کۆلسترۆڵی خوێن.
- کۆنترۆڵی گوشاری خوێن.
- کۆنترۆڵی قەند(شەکر)ی خوێن.
- دەرمانی ئەو نەخۆشییانەی کە دەبنە هۆی خراپتر و زۆرترکردنی ئێشی دڵ.

---

147 Coronary artery bypass graft

## بەشی سی و یەک
## سەکتەی دڵ




**جەڵتە(سەکتەی) دڵ چیی،**

به بەسترانی خوێنبەری کرۆنێریی و نەگەیشتنی خوێن به بەشێک لە ماسولکەی دڵ کە دەبێتە هۆی مردنی تان و پۆی دیواری دڵ – پێی دەگوترێ سەکتەی دڵ[148].

**هۆیەکانی سەکتەی دڵ کامانەن؟**

- ئەستوور و ڕەقبوونی خوێنبەری کرۆنێریی.
- گرژیی خوێنبەری کرۆنێریی.
- ئەمبۆلی کرۆنێریی (بۆ نمونە جیابوونەوەی دەڵەمەی خوێن لە دیوارەی ڕەگەکان و ڕۆیشتنی بەرەو دڵ دەتوانێ ببێتە هۆی بەستنی خوێنبەری کرۆنێریی).
- هەوکردنی خوێنبەری کرۆنێریی.
- بەرزبوونەوەی خەستیی خوێن و پێکهاتنی دەڵەمەی خوێن.

بۆ زانینی هۆکارەکانی ڕیسک(موجازەفە) بڕوانە بەشی "٣٠".

---

148 Myocardial Infarction

**نیشانەکانی سەکتەی دڵ کامانەن؟**

- ئێش. سەدا ٦٠ هەتا ٦٥ی نەخۆشەکان دوای کاری جەستەیی و لە کاتی پشوودانیدا تووشی ژانێکی کتوپڕ لە پشت چەڵەمەی سنگ دەبن. ئەم ئێشە بۆ ماوەی پتر لە نیو کاتژمێر درێژەدەکێشێ و بە خواردنی نیترۆگلیسرین کۆتایی پێنایە.
- ئێش دەتوانێ بەرەو نێوان دەفەی دوو شان، هەر دوو دەست، مل، شەویلکەی خوارێ، پشت و گەدە تەشەنە بکا.
- دڵ تێکەڵاتن.
- ڕشانەوە.
- پشووسواریی.
- دڵەکوتە.
- سەرگێژە.
- یاو(تا).
- بێهۆش بوون(لە هۆش چوون).
- ئارەقە،هەروەها دڵە ڕاوکە و ترس لە مردن، لە نیشانەکانی سەکتە ی دڵن.

**سەدا ٢٠ی ئەو کەسانەی کە تووشی سەکتەی دڵ دەبن هەست بە ئێش ناکەن، بە تایبەتیی ئەوانەی کە نەخۆشیی شەکریان هەیە. لە سەدا ١٥ی نە خۆشەکاندا هیچ نیشانەیک نابیندرێ. ئەم حاڵەتە لە ژناندا زۆرترە.**

## سەکتەی دڵ چۆن دیاریی دەکرێ؟




سـەکتەی دڵ بە پێـی نیشـانەکان، گۆڕانکـاریی هێڵکـاری دڵ وەکـو بەرزبوونەوەی سیگمێنتی[149] ST و چوونەسەرێی ترۆپۆنین[150] و کراتێنین فۆسفۆکیناز **ئەم ب**[151] لە خوێندا دەسنیشاندەکرێ.

## سەکتەی دڵ چۆن دەرمان دەکرێ؟

ئەو کارانە لە لایەن دکتۆری پسپۆڕەوە بە خێرایی ئەنجام دەدرێن:

- پێدان یان لێدانی ئەسپرین لە ڕێگای خوێنهێنەرەوە بۆ کەمکردنەوەی خەستیی خوێن و پێشگیری لە پێکهاتنی زۆرتری دەڵەمەی خوێن.
- گەیاندنی ئۆکسیژن لە ڕێگای لوتەوە.
- بـەکارهێنـانی نیترۆگلیسـیرین بـۆ کـەمکـردنەوەی ژان و گرژیـی[152] خوێنبەری کرونێریی و گەیاندنی ئۆکسیژێنی زۆرتر بە دڵ.
- لێدانی ئازارشکێنی بە هێز وەکو مۆرفین[153].

149 Segment, بەش، قەتعە، کەرت

١٥٠- ترۆپۆنین (Troponin) چەشنە پرۆتینێکی ماسولکەی دڵە کە لە کاتی مردنی خانەکانی ماسولکەی دڵدا دەڕژێتە نێو خوێن.

151 CPK-MB, چەشنێک ئانزیمی دڵە

152 Spasm

- لیدانی هێپارین[154] بۆ ماوەی چەند ڕۆژ بۆ پێشگیری لە پێکهاتنی دەڵەمەی خوێن.
- بەکارهێنانی کاپتۆپریل[155] بۆ والاکردنەوەی خوێنبەر و گەیاندنی خوێنی پێویست بە دڵ، کەمکردنەوەی فشاری خوێن و هێنانەخوارەوەی ڕێژەی مردنی نەخۆش.
- هێنانەخوارەوەی  پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژن و ڕێکوپێک کردنی کاری دڵ. بۆ وێنە، کەڵکوەرگرتن لە مێتوپرۆلۆل[156].
- لە نێوبردنی دەڵەمەی خوێن و کردنەوەی ڕێگای خۆێنبەر بە لیدانی دەواگەلێک وەکو ستریپتۆکیناز[157] .
- ئانژیۆپلاستیی[158] بۆ پێشگریی بەسترانی خوێنبەری کرۆنێریی و لە نێوبردنی دەڵەمەی خوێن.

**بۆ پێشگیری لە سەکتەی دڵ پێویست بە چ کارێکە؟**

گۆڕانی شێوەی ژیانی نەخۆش، هەروەها ئەو کەسانەی کە نایانەوێ لە داهاتودا تووشی نەخۆشیی دڵ بن، دەتوانێ ڕۆڵێکی بەرچاو بۆ پاراستنی ساغ و سلامەتیی بگێڕێ. لەمەڕ ئەمەش لە بەرچاو گرتنی خالەکانی خوارە وە پێویستە:

- گرتنی ڕژیمێکی درووستی خواردن.

---

153 Morphine sulphate
154 Heparin
155 Captopril
156 Metoprolol
157 Streptokinase
١٥٨- لە ئانژیوپلاستییدا (Angioplasty) لە ڕێگای خوێنبەرێکی دەست یان لاڕان کاتێترێکی باڵۆندار دەکرێتە نێو خوێنبەری کرۆنێریی و بە باکردنی باڵۆنەکە ئەم ڕێگایە دەکرێتەوە.

- جوولاَنو هەڵسوران بەتایبەتیی وەرزشکردنی بەردەوام.
- کۆنترۆڵی قورسایی جەستە.
- وەلانانی جگەرە.
- کۆنترۆڵی فشاری خوێن.
- کۆنترۆڵی قەند(شەکر)ی خوێن.
- کۆنترۆڵی سترێس(دڵەڕاوکێ).
- خواردنی حەبی هێنانەخوارێی کۆلسترۆڵ.

## بەشی سي و دوو
## ناتەواویی دڵ



### ناتەواویی دڵ[١٥٩] چییە؟

مەبەست لە ناتەواویی دڵ، لاوازیی دڵ بۆ پۆمپاژ کردنی(پاڵ پێوەنانی) خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکانە. ناتەواویی دڵ نەک نەخۆشی، بەڵکو ئاکامی ئەو نەخۆشییانەیە کە دەبنە هۆی شێوان و تێکچوونی پێکهاتە و کاری ئاسایی دڵ.

### هۆکانی ناتەواویی دڵ کامانەن؟

- نەخۆشیی خوێنبەری کرونێریی دڵ.
- سەکتەی دڵ.
- بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن.
- نائاسایی دەربیچەکانی دڵ.
- نەخۆشیی ماسولکەی دڵ[١٦٠].

---

159 Failure Heart

- هەوکردنی ماسولکەی دڵ[161].
- نەخۆشیی زگماکیی دڵ.
- نەخۆشیی سەختی سییەکان.
- نەخۆشیی(شەکرە) قەند.
- کەم خۆێنیی.
- پڕکاریی لووی تیرۆئید.
- و ....




**میکانیزمی ناتەواویی دڵ چییە؟**

پاش زۆربەی نەخۆشییە درێژخایەکانی دڵ، کاری پۆمپاژکردنی دڵ دە شێوێ و دڵ ناتوانێ خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان بنێرێ، بەم حاڵەتە **ناتەواویی دڵ** دەگوترێ. لە ناتەواویی دڵدا رێژەی خوێنی گەڕاوە بۆ دڵ زۆرترە لە خوێنی پۆمپاژکراوە. ئەمە دەبێتە هۆی پەنگخواردنەوەی خوێنی

160 Cardiomyopthy
161 Myocarditis

نێو دڵ [١٦٢] ، نگەیشتنی خوێنی پێویست بە ئەندامەکانی‌تری جەستە، گەڕانە وەی خـــوێن لـــە لای چـــەپـــی دڵەوە بـــۆ خوێنهێنـــەری ســـیپەلک[١٦٣]. پەنگخواردنەوەی خوێن و بەرزبوونەوەی فشاری نێو خوێنهێنەری سیپەلک، دەبێتە هۆی چوونی بەشیک لە شلەئاوی خوێن بۆ نێو سیی‌یەکان وماسینی ئەوان[١٦٤]. ئـەم حاڵەتـانە ئاکامی نـاتەواویی بـەشـی چـەپی دڵە[١٦٥]. تێکچوونی هێزی پۆمپاژکردنی بەشی ڕاستی دڵ دەبێتە هۆی پەنگخواردنەوەی خوێنی دیـوەکـانی بـەشـی ڕاسـتی دڵ و گەڕانـەوەی خـوێن لە خوێنهێنـەرەکانـدا. پەنگخواردنەوەی خوێن و چوونەسـەرێی فشـاری نێو خوێنهێنـەرەکـان، دە بێتە هۆی چوونی بەشێک لـە شـلەئاوی خـوێن بـو نێو تـان و پۆی ئـەندامـە کان‌و ماسینی ئـەوان. ئـەم حـاڵەتە ئاکامی نـاتەواویی بـەشـی ڕاستی دڵە[١٦٦]. ناتەواویی دڵ نەخۆشـیی‌یەکی درەیژخایـەنـە و ئـەمـە بـەو واتایەیە کـە بـەرە بەرە کـاری دڵ لاوازتـر و خراپتـر دەبـێ. دڵ بـۆ ئەوەی بتـوانێ خـوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان بنێرێ، تووشی گۆڕانکاریی وەک هەراویی دیوەکانی دڵ و ئەستووربوونی ماسولکەی دڵ دەبێ. ئەم دوو حاڵەتە لـەسـەرەتـادا دە بنە هۆی گرژبوونی بە هێزتری دڵ و ناردنی خوێنی پێویست بۆ ئەندامەکان ، بەڵام لە ئاکامدا کاری دڵ لاوازتر و بێ‌هێزتر دەکەن.

**نیشانەکانی ناتەواویی دڵ کامانەن؟**

- پشووسـواریی[١٦٧] لـە کـاتی چـالاکی وهەڵسـووڕان یاپشـوودان و یـا خەوتندا،
- کۆخەی بەردەوام یا سیخەی سنگ[١٦٨]،

---

162 Congestion
163 Pulmonary vein
164 Pulmonary edema
165 Left-sided heart failure
166 Right-sided heart failure
167 Dyspnea

- ماسینی[169] لاقەکان، مەچەکی پێ و زگ،
- ماندوویی بەردەوام بەتایبەتی لەکاتی پیاسە و هەر چەشنە کارێکی فیزیکیدا،
- بێئیشتیایی.
- دڵ تێکەڵاتن.
- سەرەگێژە و شێواوی[170] بەهۆی گۆڕینی ڕێژەی سودیۆمی خوێن.
- چوونەسەرێی ڕادەی لێدانی دڵ.
- سنگ ئێشە.

**ناتەواویی دڵ چۆن دەسنیشاندەکرێ؟**

ناتەواویی دڵ بە پێی نیشانەکان، پشکنینی خوێن (چوونەسەرێی هۆرمۆنی ناتریئووریتیک[171] پێپتاید لە چەشنی " ب" لە خوێندا و ...)، وێنەگرتنی سنگ بە یارمەتیی تیشکی ئێکس ( ماسینی سییەکان، گەورەبوونی نائاسایی دڵ و ...)، ئێکۆکاردیۆگرافیی[172] و کاردیو ـ کامپیۆتر تۆمۆگرافیی و شکڵ دروسکردنی موگناتیزی بە دەنگی بە هێز [173] بۆ هەڵسەنگاندنیی کار و گۆڕانکارییەکانی پێکهاتەی دڵ) و کرۆنێرئانژیۆگرافی بە تایبەتیی ئەو کاتەی کە گومان لە سیندرۆمی کتوپڕی کرۆنێریی دەکرێ یا جارێ هۆیەکانی بە درووستی دەسنیشاننەکراون، دیاری دەکرێ.

---

168 Wheezing
169 Edema
170 Confusion
١٧١- هۆرمۆنێکە کە لە کاتی ناتەواویی دڵدا، لە سکۆڵەکانی دڵەوە دەڕژێتە ناو سیستمی گەڕانی خوێن.
B-Type natriuretic peptide(BNP)
172 Echocardiography
173 Cardio - CT & MRI

**ناتەواویی دڵ چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

ئامـانجی سـەرەکی، کـەمکـردنەوەی نیشـانەکـانی نـەخۆشـیی و هێنانـە خوارێی ڕێژەی مردنی نـەخۆشـە. کـارتێکریی دەواکـان بـریتین لـە ژیانـەوە، پاراستنی کاری ئاسایی دڵ و کەمکردنەوەی ماسینی سییەکان. بەم مەبە ستە ئەم دەوایانە بە پێی هۆ، پلـە و ڕادە، نیشـانە و شـێوانی کـاری تـایبەتیی دڵ لە ژێر چاودێریی دکتۆر بە کار دەبردرێن:

- دەوا بـۆ گـەورەکردنەوەی ڕەگەکـان، باشـترکردنی ڕۆیشـتنی خوێن و هینانەخوارەوەی فشاری خوێن، وەکو هیدرالازین[١٧٤] و کاپتۆپریل.
- دەوا بـۆ کـەمکـردنەوەی هـەوکردنی سـییەکان و لاقەکـان وەکـو فوراسێمید[١٧٥] .
- دەوا بۆ بـەرزکـردنەوەی هێزی گرژبوونـەوەی دڵو نـاردنی خـوێن بۆ ئەندامەکان وەکو دیگۆکسین[١٧٦].
- جاروبار بۆ کەمکردنەوەی نیشانەکانی نەخۆشی و باشترکردنی ڕەوتـی خـوێن لـە نەشـتەرگەریی "بایپـەسـی" خوێنبـەری کرۆنێـری یـان ئانژیۆپلاستیی کەڵک وەردەگیرێ. ئەو کاتەی کە دڵ بە شێوەیەکی بەرچاو کارایی پۆمپاژکردنی خوێن لە دەست بدا، گۆڕین و چاندنی دڵ[١٧٧] دەتوانێ تەنیا ڕێگای پاراستنی ژیانی نەخۆش بێ.

---

دەوا:دەرمان-داودەرمان

174 Hydralazine
175 Furosemide
176 Digoxin
177 Heart transplantation

## بەشی سی و سێ

## نەخۆشیی دەریچەکانی دڵ[178]

### تەنگیی دەریچەی ئائۆرت[179]

تەنگیی دەریچەی ئائۆرت دەبێتە هۆی پێشگیری لە ڕۆیینی ئاسایی خوێنی خاوێن لە ڕێگای ئائۆرتەوە بۆ ئەندامەکان. ئەندازەی ئاسایی دە ربیچەی ئائۆرت ٣ سانتی مەتری چوارگۆشەیە.




نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کاتێک دەبیندرێ کە ئەندازەی دەریچە ی ئائۆرت بگاتە کەمتر لە ١ سانتی مەتری چوارگۆشە . تەنگیی دەریچەی ئائۆرت دەبێتەی هۆی چوونەسەرەوەی فشاری نێو سکۆڵەی چەپ، ئەستووربوونی[180] ماسولکە و هێنانەخوارەوەی هێزی گرژبوونی دڵ.

---

178 Heart Valve Disorders
179 Aortic Stenosis
180 Hypertrophy

**هۆیەکان تەنگیی دەریچەی ئائۆرت کامانەن؟**

- **کۆبوونەوەی کەلسیۆم لە سەر دەریچەی ئائۆرت.** چوونەسەرێی تەمەن دەتوانێ هۆی کۆبوونەوەی کالسیومی خوێن لە سەر دەریچەی ئائۆرت بێ. لە کەسانێکدا کۆبوونەوەی کالسیوم ڕەنگبێ ببێتە هۆی تەنگیی دەریچەی ئائۆرت.
- **تای رۆماتیزمی**[181]
- **هەوی چڵکیی گەر و بە هۆی ستریپتۆکۆکەوە** (چەشنە بەکتریایەک) بە تایبەت لەکاتی منداڵیدا سەرچاوەی ئەم نەخۆشییەیە. ئەم نەخۆشییە دەبێتە هۆی پێکهاتنی جێیبرین[182] و تەنگیی دەریچەی ئائۆرت و دریچەکانیتری دڵ.
- **ئاڵۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی دڵ.** منداڵگەلێک بە تەنگیی زگماکیی ئائۆرت لە دایک دەبن. ڕێژەی ئەم حاڵەتە لە نێوان کوڕ و کچدا چوار بە یەکە.

**نیشانەکان تەنگیی دەریچەی ئائۆرت کامانەن؟**

- سینگئێشە.
- نێشانەکانی ناتەواویی دڵ.
- بورانەوە[183]
- ماندوویی و داکشانی هێز لە کاتی چالاکییدا
- هەناسە بڕکێ بەتایبەتیی لەکاتی چالاکیی فیزیکییدا.
- دڵە کوتە.

---

181 Rheumatic fever

182 Scar tissue

١٨٣- نەگەیشتنی خوێنی پێویست بۆ ماوەیەکی کورت بە مێشک، بە تایبەتیی لەکاتی چالاکیی فیزیکییدا دەبێتە هۆی لە هۆشچوونی لەنەکاوی نەخۆش،Syncope

- ماسینی مەچەکی پێ و قاچەکان.
- مردنی لەناکاو.

### تەنگیی دەریچەی ئائۆرت چۆن دەسنیشان دەکرێ؟

دیاریی‌کردنی ئەم نەخۆشییە بە پێی نیشانەکان، دۆزراوەکانی فیزیکیی وەکو بیستنی دەنگی نائاسایی دڵ، هەراویی بەشی بەرەوژۆری ئائۆرت[١٨٤] لە وێنەی ڕکەی‌سنگ بە یارمەتیی تیشکی ئێکس، هێڵکاری دڵ، هەڵسەنگاندنی ڕادەی تەنگیی و کاری دەریچەی ئائۆرت و گۆڕانکاریی‌یەکانی دڵ بە کەڵکوەرگرتن لە ئێکۆکاردیۆگرافی‌یە.

### تەنگیی دەریچەی ئائۆرت چۆن چارەسەر دەکرێ؟

- وەلانانی هەر چەشنە کار و چالاکییەکی قورس و دژواری فیزیکی،
- بە پێی ڕادەی تەنگیی دەریچەی ئائۆرت و نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە لە دەوا یان نەشتەرگەریی‌و چاندنی دەریچەی ئائۆرت[١٨٥] کە لەکوەردەگیرێ.

### گەڕاندنەوەی ئائۆرتیی[١٨٦]

مەبەست لە گەڕاندنەوەی ئائۆرتی، گەڕانەوەی بەشێک لە خوێنی ئائۆرت بۆ نێو سکۆڵەی چەپ بە هۆی ناتەواو بەسترانی دەریچەی ئائۆرت لەکاتی خاوبوونەوەی دڵە. ئەم نەخۆشییە هەروەها وەک ناتەواویی دەریچەی ئائۆرتیش پێناسە دەکرێ.

---

184 Asending aorta
185 Valve replacement
186 Aortic Regurgitation

## هۆیەکان گەڕاندنەوەی ئائۆرتی کامانەن؟

- هەوکردنی چلّکیی نێوپۆشی دڵ[187] .
- ڕوماتیزمی دڵ.
- زەبروێکەوتن کە ببێتە هۆی دڕانی دەریچە.
- نەخۆشیي ڕیشەی ئائۆرت وەکو سیفلیسی ئائۆرت.
- بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.



## گەڕاندنەوەی ئائۆرتیی

- ئالۆزییەکانی تەواوکاریی زگماکیی دەریچەی ئائۆرت. ئەو کاتەی کە دەریچەی ئائۆرت بە جێی ٣ پەڕە، ٢ پەڕەی هەیە.[188]


Bicuspid aortic valve (abnormal)


Tricuspid aortic valve (normal)

## نیشانەکانی گەڕاندنەوەی ئائۆرتیی کامانەن؟

---

187 Infective endocarditis
188 bicuspid aortic valve

ئەم نەخۆشییە سالانی ساڵ دەتوانێ هیچ نیشانەیەکی نەبێ (بێجگە لەو کەسانەی کە هەوکردنی چڵکیی نێوپۆشی دڵ هۆی نەخۆشییانە). بە پێی پەرەسەندنی نەخۆشی و شێوانی کاری دڵ نیشانەکانی خوارەوە دەبیندرێ:

- پشووسوایی لە کاتی چالاکی و وەرزشدا.
- بوورانەوە.
- دڵ ئێشە.
- نیشانەکانی ناتەواویی دڵ.

## گەڕاندنەوەی ئائۆرتی، چۆن دەسنیشان دەکرێ؟

دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە بە پێی نیشانەکان، دۆزراوەکانی فیزیکی، وەکو بیستنی دەنگی نائاسایی دڵ، گەورەبوونی سکۆڵەی چەپ و دەرپەڕیویی بەشی بەرەوژووری ئائۆرت لە وێنەی ڕکەیسنگدا بە یارمەتیی تیشکی ئێکس، نەوار(هێڵکاری)ی دڵ، هەڵسەنگاندنی ڕادەی پانایی و کاری دەریچەی ئائۆرت بە یارمەتیی ئێکۆکاردیۆگرافییە.

## گەڕاندنەوەی ئائۆرتی چۆن چارەسەر دەکرێ؟

بەپێی نیشانەو ڕادەی شێوانی کاری دڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەوا یان نەشتەرگەری و چاندنی دەریچەی ئائۆرت کەڵکوەردەگیرێ.

## تەنگیی دەریچەی میترال[189]

تەنگیی دەریچەی مەترال دەبێتە هۆی پێشگیریی لە ڕژانی خوێنی دالانی دڵ بۆ نێو سکۆڵەیە. ئەندازەی ئاسایی ئەم دەریچەیە ٤ تا ٦سانتی مەتری

---

189 Mitral Stenosis

چوارگۆشـەیـە. تـەنگیـی ئـەم دەریچـەیـە دەبێتـە هـۆی نەگەیشـتنی خـوێنی پێویسـت بـۆ نێـو سـکۆڵەی چـەپ، بـەرزبـوونی فشـاری نێـو دالانـی چـەپ، پەنگخوارنەوەی سیپەلکی[١٩٠] و هێنانە خوارەوەی ڕادەی نـاردنی خـوێنی دڵ بۆ ئەندامەکان.




**هۆیەکانی تەنگیی دەربیجەی میترال کامانەن؟**

- ڕۆماتیزمی دڵ هۆی سەرەکیی تەنگیی دەریچەی میتراله،.
- ئالۆزییەکـانی تەواوکـاریی زگمـاکیی دڵ. منداڵگـەلێک بـە تەنگیـی زگماکیی دەریچەی میترال لە دایک دەبن و دەبێ نەشتەرگەریی بکرێن.

**نیشانەکانی تەنگیی دەریچەی میترال کامانەن؟**

- پشووسواریی.
- هێرشی شەوانەی هەناسە بڕکێ[١٩١].

190 Pulmonary congestion پەنگخواردنەوەی تراو لە سیپەلکدا
191 Paroxysmal nocturnal dyspnea

- ماسینی کتوپڕی سییەکان.
- خوێن ڕشانەوە[192]. لەوەدەچێ ئاکامی بەرزبوونەوەی فشاری نێو سییەکان بێ.

**تەنگیی دەریچەی مەترال چۆن دیاری دەکرێ؟**

دەسنیشان کردنی ئەم نەخۆشییە بە پێی نیشانەکان، دۆزینەوە فیزیکییەکان وەکو بیستنی دەنگی نائاسایی دڵ، گەورەبوونی دڵ، هەراویی دالانی چەپ و نیشانەکانی پەنگخواردنەوەی تراو لە سییەکان لە وێنەی ڕکەی سنگ بە یارمەتیی تیشکی ئێکس، نەواری(هێڵکاری)ی دڵ، هەڵسەنگاندنی ڕادەی تەنگیی و کاری دەریچەی مەترال بە یارمەتیی ئێکۆکاردیۆگرافییە.

**تەنگیی دەریچەی میترال چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

بەپێی ڕادەی تەنگیی دەریچەی میترالو سەرهەڵدانی نیشانەکان بۆ چارە سەرکردنی ئەم نەخۆشییە لە دەوا یان نەشتەرگەری و گۆڕینی دەریچەی مەترال کەڵک وەردەگیرێ.

**گەڕاندنەوەی مەترالیی[193]،**

بەسرانی ناتەواوی دەریچەی میترال لە کاتی گرژبوونەوەی سکۆڵەدا دە بێتە هۆی گەڕانەوەی خوێنی نێو سکۆڵە بۆ دالانی دڵ. ئەم کارە دەبێتە هۆی هاتنەخوارەوەی ڕادەی ڕۆیینی خوێن بۆ ئەندامەکان، بەرزبوونەوەی فشاری نێو دالان و سییەکان و لە ئاکامدا شێوانی کاری سکۆڵەی دڵ. ئەم حاڵەتە هەروەها وەک ناتەواویی دەریچەی مەترال پێناسە دەکرێ.

---

192 Hemoptysis
193 Mitral Regurgitation




**هۆیەکانی گەڕاندنەوەی مەترالیی کامانەن؟**

- هەوکردنی چلکیی نێوپۆشی دڵ.
- ڕوماتیسمیی دڵ.
- شـێوانی کـاری مەمە ماسـولکەی دڵ[١٩٤] وەک ئاکـامی نـەخۆشـیی کرونێریی دڵ.
- هەراویی سکۆڵەی چەپ.
- کاردیۆمیۆپاتیی هایپێرترۆفیک[١٩٥].

194 Papillary muscle

195 Hypertrophic Cardiomyopathy, ئەستور بوونی ماسولکەی دڵ و دیواری نێوان دوو سکۆلەی ڕاست و چەپ

### نیشانەکانی گەڕاندنەوەی مەترالیی کامانەن؟

- ماندوویی و بێ هێزی.
- هەناسە برکێ.
- ڕشانەوەی خوێن بەهۆی بەرزبوونەوەی فشاری سییەکان.
- هێرشی شەوانەی پشووسواری.

### گەڕاندنەوەی مەترالیی چۆن دەسنیشان دەکرێ؟

دیارییکردنی ئەم نەخۆشییە بە پێی نیشانەکان، دۆزراوەکانی فیزیکیی وەکو بیستنی دەنگی نائاسایی دڵ، گەورەبوونی دالان و سکۆڵەی چەپ لە وێنەی ڕکەی سنگ بە یارمەتیی تیشکی ئێکس، هێڵکاری دڵ هەڵسەنگاندنی ڕادەی پانایی و کاری دەریچەی مەترال و گەورەبوونی دالان و سکۆڵەی دڵ بە یارمەتیی ئێکۆکاردیۆگرافیی.

### گەڕاندنەوەی مەترالی چۆن چارەسەر دەکرێ؟

بە پێی ڕادەی نیشانەکان و شێوانی کاری دڵ بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە، لە دەوا یان نەشتەرگەریی و گۆڕینی دەریچەی میترال کەڵکوە ردەگیرێ.

## بەشی سي و چوار
## ئاریتمیی



**مەبەست لە ئاریتمیی[196] چییە؟**

ئاریتمیی چەمکێکە بۆ ناساندنی ئەو حاڵەتانە کە دەبنە هۆی خێرا، خاو یان ناڕێکلێدانی دڵ. بە خێرالێدانی نائاسایی دڵ، تاکیکاردیی[197] و بە خاو لێدانی نائاسایی دڵ، برادیکاردیی[198] دەکوترێ. ڕێژەی لێدانی دڵ لە تاکیکاردیی‌دا پتر لە١٠٠ کەڕەت و لە خاو لێدانی دڵ کەمتر لە ٦٠ کەرەت لە خولەکێکدایە. بە ناڕێکلێدانێ دالانی دڵ - **ئاتریال ئاریتمیی**[199] و بە ناڕێک لێدانی دڵ کە لە سکۆڵەوە دەست پێ دەکرێ **وێنتریکل ئاریتمیی**[200] دەکوترێ . مەترسی ناڕێکلێدانی سکۆڵەی دڵ بۆ مرۆڤ زۆرترە هەتا ناڕێک لێدانی دالانی دڵ.

---

196 Arrhythmia
197 Tachycardia
198Bradycardia
199 Atrial arrythmias
200 Ventricular arrythmia

**سەرچاوەی ناڕێکلێدانی دڵ کامانەن؟**

- ناتەواویی گرێی سینوسی بۆ بەرهەمهێنانی ترپەی ئەلیکتریکی[٢٠١] .
- نائاسایی‌بوونی ئەو ئاهەنگەی[٢٠٢] کە لە گرێی سینوسیی‌دا بەرهەم دێ.
- تێکچوونی ڕەوتی ڕاگوێزتنەوەی ترپە[٢٠٣] و پسان یان بەسترانی تە زووی ئەلکتریکی( لێدانی سەربەخۆی دالآن و سکۆڵە) بێ پێوەندیی لەگەڵ یەک و ...

**لە کاتی ئاریتمیی‌دا چ نیشانەیەک دەبیندرێ؟**

بە پێی چەشنی ئاریتمی لەوەدەچێ لە سینگ‌دا هەست بە نیشانەکانی خوارەوە بکرێ:

- دڵ ڕەپێ کردن[٢٠٤].
- دڵە(کوتە) تەپێی سەخت[٢٠٥] .
- تەپ تەپکردنی دڵ[٢٠٦].
- خێراو ڕێک و پێک لێدانی دڵ[٢٠٧].
- هەروەها نەخۆش لە کاتی ناڕێک لێدانی توندی دڵدا تووشی سە رگێژە، بێهۆشی، سینگ ئێشە و پشووسواری دەبێ.

---

201 Impulse formation
202 Rhythm
203 Impulse Conduction
204 Palpitations
205 Pounding
206 Thumping
207 Fluttering

**هۆیەکانی ئاریتمی کامانەن؟**

- ئاریتمیی زگماکیی دڵ.
- جگەرە، ئەلکۆڵ، کافائین، ماددەی سڕکەر.
- هێرشی دڵ.
- گەورەبوونی دڵ وەک ئاکامی بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.
- پڕکاریی تیرۆئێد.
- و هتد ...

**ئاریتمیی دڵ چۆن دیاری دەکرێ؟**

- گرتنی هێلکاری دڵ. بەم مەبەستە لە دەزگای ئەلێکترۆکاردیۆگراف[208] کەڵک وەردەگیرێ.
- گرتنی نەواری دڵ لە کاتی ئەنجامی کارێکی جەستەیی یان پاش بەکارهێنانی دەواگەلێک وەکو دۆبیوتامین[209].
- کۆنترۆڵی کاری دڵ، گوشاری خوێن، شەکری خوێن و ڕێژەی هۆرمۆنەکانی تیرۆئێدی خوێن.

**ئاریتمیی چۆن چارەسەردەکرێ؟**

چارە سەرکردنی ئاریتمیی دڵ لە پێوەندیی لەگەڵ چەشنی ئاریتمیی و ڕادەی جددی بوونیدایە. بەشێکی زۆر لە ئاڕیتمییەکان پێویستییان بە هیچ چەشنە دەرمانێک نییە. جارو بار تەنیا وەلانانی کافائین (کۆکاکۆلا، پیپسیکۆلا، قاوە و... ) دەتوانێ ببێتە هۆی گەڕانەوەی ئاهەنگی دڵ بە حاڵەتی ئاسایی خۆی. بە پێی هۆ و چەشنی ئاریتمیی بۆ چارەسەرکردنیان

---

208 Electrocardiograph
209 Dobutamine

له دەوای جۆربەجۆر، هەروەها چاندنی ترپەڕێکخەر[٢١٠] بۆ بردنەسەرەوەی ڕێژەی لێدانی دڵ و دیفیبریلێیتێر[٢١١] بۆ هێنانەخوارەوەی خێرالێدانی دڵ کە بۆ ژیانی نەخۆش جێی مەترسین، کەڵک وەردەگیرێ.

**بۆ پێشگیری لە ئاریتمیی دڵ پێویستە چی بکرێ؟**

- وەلانانی جگەرە.
- چالاکیی فیزیکیی لەژێر چاوەدێری دکتۆردا.
- خواردنی خواردەمەنی کەمچەوریی و پڕ لە فیبر( سەوزی و میوە ...).
- کۆنترۆڵی کۆلسترۆڵی خوێن.
- کۆنترۆڵی گوشاری خوێن.
- هێنانەخوارەوەی قورسایی جەستە.
- وەرزشی بەردەوام.
- کۆنترۆڵی شەکری خوێن.
- دووری لە هەر چەشنە سترێس(دڵەراوکێ)ی ڕۆحی(دەروونی).

---

210 Pacemaker
211 Defibrillator

## بەشی سي پێنج

## کاردیۆمیوپاتیی

### کاردیۆمیوپاتیی[٢١٢] چییە؟

کاردیۆمیوپاتیی نەخۆشیی ماسولکەی دڵە. وشەی *cardio* بە واتای دڵ، *myo* بە واتای ماسولکە و *pathy* بە واتای نەخۆشییە. کاردیۆمیوپاتیی دەبێتە هۆی شێوانی کاری ماسولکەی دڵ و ناتەواویی دڵ بۆ پۆمپاژی خوێن.

### جۆرەکانی کاردیۆمیوپاتیی کامانەن؟

### ١- کاردیۆمیوپاتیی والآ[٢١٣]




لەکاردیۆمیوپاتیی والآدا، دڵ گەورەیە و هەر دوو سکۆڵەکان تووشی هەراویی دەبن، هەروەها هێزی گرژبونەوەی دڵ و پۆمپاژی خوێنیش کە مدەبێتەوە.

---

212 Cardiomyopathy
213 Cardiomyopathy Dilated(congestive)

**هۆیەکانی کاردیۆمیوپاتیی والآ کامانەن؟**

- نەناسراو[٢١٤].
- بنەماڵەیی
- ئەلکۆڵیی‌بوون.
- نەخۆشیی خوێنبەری کرۆنێریی دڵ (کاردیۆمیوپاتیی پاش سەکتەی دڵ لە سەتا ٥٠ تا ٩٠ بوارەکاندا هۆی ناتەواویی دڵە).
- بەرزبوونی فشاری خوێن.
- خووگریی بە کۆکائین و هیرۆئین.
- ماددەی ژەهراویی[٢١٥] وەکو کوبالت، فۆسفۆڕ، کاربۆن مۆنۆئۆکسید، جیوە،
- دابەزینی رادەی کالسیۆمی خوێن(هیپۆکالسیمی[٢١٦]).
- پڕکاریی لووی تیرۆئید.
- دەواکانی دژی ڕیترۆڤایرۆس وەکو
- Zalcitabine ،Didanosine،Zidovudine
- نەخۆشی(شەکرە) قەند.
- فێنوتیازینەکان[٢١٧] .
- و هتد ...

---

214 Idiopathic
215 Toxins
216 Hypocalcemia
217 Phenothiazines

گرووپێکە لە دەواکان کە بۆ دەرمانی نەخۆشیی ڕۆحیی وەک شیزۆفێرنی و هتد ... بە کار دەبردرێ.

**نیشانەکانی کاردیۆمیوپاتیی والا کامانەن؟**

- پشووسواریی لە کاتی جەموجوڵدا.
- هێرشی شەوانەی پشووسواریی.
- ماندوویی و داکشانی هێز.
- دڵەکوتە.
- سنگ ئێشە.
- خێرالێدانی دڵ لە کاتی پشوودانادا.

**کاردیۆمیوپاتیی والا چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

- بۆدەرمانی ئەم نەخۆشییە، بڕوانە هۆکانی ئەم نەخۆشییە.
- چاندنی دڵ لەو کەسانەی کە تەمەنیان ژێرەوی ٦٠ ساڵە و دەوا کارتێکەریی لە سەر ئەوان نەماوە.

**٢- کاردیۆمیوپاتیی هایپێرترۆفیک**[٢١٨]

لەم نەخۆشییەدا ئەستووریی ماسولکەی دڵ و دیواری نێوەڕاستی هەر دوو سکۆڵەکانی ڕاست و چەپ دەبیندرێ. ئەستووربوونی دیواری نێوان سکۆڵەکان لە کاتی گرژبوونەوەی سکۆڵەی چەپ، دەبێتە هۆی تەنگبوونەوەی ناوچەی ژێرئائۆرت کە ئاکامی نزیکبوونەوەی دەریچەی مەتراله بە دیواری نێوەڕاستی دڵ. ئەم حاڵەتە بە تایبەتیی لە کاتی وەرزشدا دەتوانێ بەشێوەیەکی لەناکاو ببێتە هۆی بەسترانی تەواوی ڕەوگەی ڕۆیشتنی خوێن و ڕاوەستانی دڵ.

---

218 HypertrophicCardiomyopathy, ئەستووربوونی نائاسایی ماسولکەی دڵ




**هۆیەکانی کاردیۆمیوپاتیی هایپێرترۆفیک کامانەن؟**

**هەر شتێک یان ئاکارێک کە ببێتە هۆی بە هێزکردنی ڕەوتی گرژبوونەوی دڵ و لە ئاکامدا زۆرترکردنی تەنگیی ڕەوگەی ڕۆیشتنی خوێن.** بۆ نموونە:

- دەوا وەکو دۆپامین[219]، ئیپینئفرین[220]، نیترۆگلیسیرین[221]، میزهێنەرەکان و ئەلکۆڵ.
- کەم بوونەوەی نائاسایی ئاویلکەی جەستە[222] .
- خێرالیێدانی دڵ.
- لە سەر پێ ڕاوەستان.

219 Dopamine
220 Epinephrine
221 Nnitroglycerin
222 Hypovolemia

**هەر شتێک یا ئاکارێک کە ببێتە هۆی خاوکردنی ڕەوتی گرژبوونەوەی دڵ، تەنگیی ڕەوگەی ڕۆیشتنی خوێن کەمتر دەکاتەوە.** بۆ وێنە:

- دەوا وەکو پرۆپرانۆلۆڵ[٢٢٣]، ویراپامیل[٢٢٤].
- زۆربوونی نائاسایی ئاویلکەی جەستە[٢٢٥] .
- خاولێدانی دڵ.
- هەڵتروشکان.

**نیشانەکانی کاردیۆمیوپاتیی هایپێرترۆفیک کامانەن؟**

- پشووسواریی.
- لە هۆشچوون بۆ ماوەیەکی کورت (لەکاتی وەرزشدا).
- سنگئێشە (ڕاکشان دەبێتە هوی کەمکردنەوەی ئێش).
- دڵە کوتە.
- مردنی لەنەکاو دەتوانێ تەنیا نیشانەی ئەم نەخۆشییە بێ (ئەم حاڵەتە بە تایبەتی لە لاوان لە کاتی وەرزشدا دەبیندرێ).

**کاردیۆمیوپاتیی هایپێرترۆفیک چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

- دەوا بۆ هێنانەخوارێی کار و پێداویستیی دڵ بە ئۆکسیژن( پرۆپرانۆلۆل، ویراپامیل).
- نەشتەرگەریی دڵ.

---

223 Propranolol
224 Verapamil
225 Hypervolemia

## ٣- کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسک[226]




لە کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسکدا خوێنی نێو دالانەکان لەکاتی خاوبوونەوەی دڵ دەڕژێتە نێو سکۆڵەکان. گرژمانەوەی سکۆڵە وەک ئاکامی ڕەقبوون و نەگۆڕیی ماسولکەی سکۆڵە، دەبێتە هۆی پێشگیری لە گەیشتنی خوێنی پێویست بە دیوەکان و گەڕانەوەی خوێن بۆ نێو سیستمی سووڕانەوەی خوێن.

### هۆکانی کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسک کامانەن؟

نەخۆشیی ئەندامەکانی دیکە سەرچاوەی سەرەکیی ئەم نەخۆشییەن، وەکو:

- **ئامیلۆئیدۆز**[227]. یەکێک لە هۆکانی سەرەکیی ئەم چەشنە کاردیۆمیوپاتییە کە جاروبار لە پێوەندیی لەگەڵ شێرپەنجەکاندا دەبیندرێ.

---

226 Restrictive Cardiomyopathy

227 Amyloidosis,

ئامیلۆئیدۆز بە واتای نیشتن و کۆبوونەوەی ئامیلۆئید لە ئەندامەکانە کە دەبێتە هۆی ڕەق و ئەستووربوون و شێوانی کاری ئاسایی ئەندام. ئامیلۆئید چەشنە پرۆتێینی روون و بەرهەمی ڕزینی تان و پۆکانی لەشە.

- **هێموکرۆماتۆز**[٢٢٨] لەم نەخۆشییەدا ئاسن بە شێوەیەکی نائاسایی و لە ڕادەبەدەر لە ئەندامەکاندا کۆ دەبێتەوە.
- **سارکۆئیدۆز**[٢٢٩]. نەخۆشییەکی دریژەخایەنی سیستمیکە کە هۆکانی جاریٚ نەناسراوە. لە زۆربەی ئەندامەکانی جەستەدا، گرێی زۆر ورد بە ئەندازەی شەکر یان خیز بەرهەم دێ کە پێیان گرانولۆم[٢٣٠] دەکوترێ.
- **هێرشی دڵ** کە ببێتە هۆی پێکهاتنی جێبرین[٢٣١].
- **کارتێکەریی ژەهراویی ئانتراسیکلین**[٢٣٢] (لەم دەوایە بۆ دەرمانی شێرپەنجەی خوێن کەڵکوەردەگیرێ).
- **نەخوشیی قەند.**
- و هتد ...

**نیشانەکانی کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسک کامانەن؟**

- ماسینی دەستو پێ.
- ماندوویی و داکشانی هێز.
- پشووسواریی لەکاتی وەرزشدا.
- کۆبوونەوەی نائاسایی ئاو لە نێو دیوەکانی جەستە[٢٣٣].
- ئاریتمیی دڵ.

**کاردیۆمیوپاتیی بەرتەسک چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

---

228 Hemochromatosis
229 Sarcoidosis
230 Granulomas
231 Scar
232 Anthracycline
233 Ascites

- دەرمانی ئەو نەخۆشییانەی کە سەرچاوەی کاردیۆمیوپاتیین.
- بە پێی نەبوونی دەرمانی تایبەتی، تەنیا دەکرێ نیشانەکانی نە خۆشی و ناتەواویی دڵ کۆنترۆڵ بکرێ (بڕوانە بەشی ناتەواویی دڵ).
- چاندنی دڵ.

## بەشی سي و شەش

## هەوی ماسولکەی دڵ[٢٣٤]

### هۆکانی هەوی ماسولکەی دڵ کامانەن؟

- هەوی چڵکیی ڤایرۆسی (بە تایبەتیی کۆکساکی ڤایرۆسی B )، بەکتریایایی و ...
- یاو(تا)ی ڕوماتیسمیی.
- کارتێکەریی بەشێک لە دەواکان وەک : کۆکائین[٢٣٥]، سولفونامیدەکان[٢٣٦] ، ئیزونیازید[٢٣٧]، تیتراسیکلین[٢٣٨]، تری سیکلیک ئەنتیدیپرێسانتەکان[٢٣٩] و...
- ژەهرەکان[٢٤٠] وەک کاربۆن منۆئۆکساید، ژەهری دیفتیری، ئارسینیک و...
- نەخوشیی سیستێمیکی جەستە وەکو "هەوکردنی ڕەگەکانی خوێن[٢٤١] و سارکۆئیدۆز.

### نیشانەکانی هەوی ماسولکەی دڵ کامانەن؟

- ماندوویی و داکشانی هێز.
- ئێشی ماسولکە وجومگەکان.
- یاو(تا).

---

234 Myocarditis
235 Cocaine
236 Sulfonamides
237 Isoniazide
238 Tetracycline
239 Trycyclic antidepressants
240 Toxins, ماددەی ژەهراویی
241 Vasculitis

- ئاریتمیی.
- پشووسواری (بە تایبەتیی لە کاتی وەرزشدا).
- بێهۆش بوون(دەتوانێ ئاکامی ئاریتمیی دڵ بێ).
- سنگئێشە.
- هەروها نیشانەکانی ناتەواویی دڵ.

**لە منداڵاندا زۆرتر نیشانەکانی خوارەوە دەبیندرێن:**

- بەرزبوونەوەی(تا) یاو.
- بێئیشتیهایی.
- شین و بۆربوونەوەی ڕەنگی پێست.

**ئاڵۆزییەکانی هەوی ماسولکەی دڵ کامانەن؟**

هەوکردنی ماسولکەی دڵ دەتوانێ ببێتە هۆی خاڵەکانی خوارەوە:

- گەورەبوونی دیوەکانی دڵ و گەورەبوونی نائاسایی دڵ[٢٤٢] .
- ئازاری سلولەکانی ماسولکەی دڵ.
- ناتەواویی دڵ.
- پێکهاتنی دەڵەمەی خوێن[٢٤٣] لە دیواری دیوەکانی دڵدا.
- جوێبوونەوەی دەڵەمەی خوێن و ڕێکەوتنی بۆ نێو سیستمی گەڕانی خوێن هۆی سەکتەی دڵ و مێشک لەم نەخۆشانەدایە.

---

242 Cardiomegaly
243 Thrombosis

**هەوی ماسولکەی دڵ چۆن دیاریی دەکرێ؟**

هەوی ماسولکەی دڵ بە پێی نیشانەکان، گۆڕانکاریەکانی نەوار(هێلکار) ی دڵ و دەنگیی دڵ، دیاریی‌کردن ڤایرۆس لە پیسایی‌دا، تراوی گەرو یان بەشەکانی دیکەی لەش، بیۆپسی لە نێوپۆش و ماسولکەی دڵ، وێناکردنی زرنگانەوەی موگناتیسی و گۆڕانی دژەلەشەکان[٢٤٤] دەسنیشان دەکرێ.

**هەوی ماسولکەی دڵ چۆن چارەسەردەکرێ؟**

- دەرمانی ئەو هۆیانەی کە سەرچاوەی ئەم نەخۆشییەن.
- ئاستەنگیی جموجوڵی فیزیکیی جەستە (بۆ هینانەخوارەوەی کاری دڵ).
- دەرمانی ئاریتمیی دڵ.
- دەرمانی ناتەواویی دڵ ( بڕوانە بەشی ناتەواویی دڵ).

---

244 Antibody ،دژەتەن

## بەشی سی و حەوت
## هەوی دڵپۆش[٢٤٥]




**هۆکانی هەوی دڵپۆش کامانەن؟**

- چڵکی ڤایرۆسی، وەکو ئیکۆڤایرۆس[٢٤٦] و کۆکساکی ڤایرۆس[٢٤٧] .
- نەخۆشیی سیستمیک وەکو نەخۆشییەکانی خۆپاریزیی، یاو(تا)ی رۆماتیزمی، سیل، شێرپەنجە. ناتەواویی گورچیلە.
- نەخۆشیی دڵ وەکو هێرشی دڵ[٢٤٨] و هەوکردنی ماسولکەی دڵ.
- تیشک دەرمانیی[٢٤٩] سنگ و کەڵکوەرگرتن لە ئەو دەوایانەی کە دەبنە هۆی کزیی سیستمی بەرگریی جەستە.
- زەبروێکەوتن بە هۆی ئازارو نەشتەرگەری.
- هۆی نەناسراو.

---

245 Pericardium
246 Echovirus
247 Coxsackievirus
248 Heart attack
249 Radiation therapy

- هەوی دڵپۆش زۆرتر لە نێو پیاوانی ٢٠تا ٥٠ ساڵان دوای نە خۆشیی چڵکیی سییەکان و لە منداڵانیشدا دوای نەخۆشیی ڤایرۆس[٢٥٠] و کۆکساکی ڤایرۆس دەبیندرێ.

### نیشانەکانی هەوی دڵپۆش کامانەن؟

- ئێشی سنگ ئاکامی هەوکردنی تان و پۆی پریکاردۆ و لێکخشانی لەگەڵ دڵە. ئەم ئێشە لە کاتی دانیشتن و چەمانەوە بۆ پێشەوە کەمدەبێتەوە، بەڵام هەناسەکێشانی قوڵ و ڕاکشان ئێش زۆرتر دەکا. ئێش بەرەو مل، دە فەی شان، زگ و پشت ڕادەکێشرێ.
- هاتنەخوارەوەی ڕادەی وەدەرنانی خوێنی دڵ بەرەو ئەندامەکان لە خولەکێکدا دەبێتە هۆی داکشانی هێز، ماندوویی، هاتنەخوارەوەی فشاری خوێن و خێرالیدانی دڵ.
- بەرزبوونەوەی فشاری سیستێمیکی خوێنهێنەرەکان دەبێتە هۆی گە ورەبوونی جەرگ[٢٥١] . کۆبوونەوەی نائاسایی و لە ڕادەبەدەری شلەئاو لە بەشەکانی جەستە، ماسینی(ئەستووربوون)ی لاق، مەچەکی پێ و زگ.
- پەنگخواردنەوەی خوێن لە خوێنهێنەری سیپەلکی[٢٥٢] بە تایبەتیی لە کاتی ڕاکشاندا دەبێتە هۆی کۆخەی وشک و سەرهەڵدانی پشووسواری.
- یاو.
- پەشێوی.

---

250 Adenovirus
251 Hepatomegaly
252 Venous pulmonary congestion

**هەوی دڵپۆش چۆن دیاری دەکرێ؟**

ئێکۆکاردیۆگرافی باشترین شێوەی دەسنیشانکردنی هەوی دڵپۆش و تامپۆنادی دڵە[253]. لە ڕێگای ئێکۆکاردیۆگرافییەوە بە باشی دەکرێ شلەئاوی پریکاردۆ چۆنییەتی پێکهاتە و کاری دڵ دیاری بکرێ.

**هەوی دڵپۆش چۆن چارەسەر دەکرێ؟**

- دەرمانی هۆی نەخۆشییەکە.
- ئازارشکێن.
- دەوا بۆ دەرمانی هەوی پریکاردۆ وەکو ئیبۆپرۆفین[254]. ئەسپرین و جاروبار کۆرتیکۆسترۆئیدەکان[255].
- میزهێنەرەکان بۆ کەمکردنەوەی شلەئاوی لە ڕادەبەدەر و نائاسایی نێو توورەکەی پریکارد،



- دەرکێشانی شلەئاو لە ڕێگای پریکاردیۆسێنتێز[256] (لەم حاڵەتەدا بە دوای رۆکردنی دەرزیەکی نێو خاڵی، یان کاتێتر، شلەئاوی نێو توورەکەی پریکارد خاڵی دەکرێ).
- ئەنتیبیوتیک بۆ دەرمانی هەوکردنی بەکتریایی.
- نەشتەرگەری لە کاتی درێژخایەن بوونی نەخۆشی و

253 Tamponade
254 Ibuprofen
255 Corticosteroid
256 Pericardiocentesis

ڕەقی و ئەستووریی دڵپۆشدا. دەبی ئەم تۆێخە لە ڕێگای نەشتەرگەرییەوە لە دڵ جویکرێتەوە[257].

**ئاڵۆزیی و مەترسییەکانی هەوی دڵپۆش کامانەن؟**

- ئاریتمیی دڵ.
- تامپۆنادی دڵ. زۆربوونی لە ڕادەبەدەری شلەئاوی نێو توورەکەی دڵپۆش دەبێتە هۆی فشارهاوردن[258] بە دڵ.
- هەوی دڵپۆشی بەرتەسک[259] – هەوکردنی توورەکەی دڵپۆش دە توانێ ببێتە هۆی ڕەق و ئەستوربوونی ئەم چینە و نووسانی بە دڵ. ئەم حاڵەتە کە پێشگیریی لە گیربوونەوە و خاوبوونەوەی دڵ و پڕبوون و ناردنی خوێن دەکا، دەتوانێ یەکێک لە هۆیەکانی ناتەواویی دڵ بێ.

---

257 Pericardiectomy
258 Compression
259 Constrictive Pericarditis

## بەشی سی و هەشت

## هەوی نێوپۆشی دڵ [260]




**نێوپۆشی دڵ چییە؟**

نێوپۆشی دڵ تۆیخی نێو دڵە، کە تەواوی ژووری دڵ، دەریچەکان و دیوەکانی دادەپۆشێ. دەریچەکانی دڵ زۆرتر تووشی ئەم نەخۆشییە دەبن.

**هۆیەکانی هەوی نێوپۆشی دڵ کامانەن؟**

بەکتریایەکان سەرچاوەی سەرەکیی هەوی نێوپۆشی دڵن. بەکتریایەکانی گرووپی ستافیلۆکۆک[261] ستریپتۆکۆک[262] یا ئەو بەکتریایەی کە لە حاڵەتی ئاساییدا لە پێست و دەمی مرۆڤدا دەژین، بە هۆی ئازار و برینداربوونی پێست، نەشتەرگەریی ددان و نێو دەم، جێی دەرزی بە تایبەتی لە خووگرە کان بەماددەی سڕکەر، ڕەوانەی خوێن دەبن و لە ڕێگای سیستێمی سووڕانی خوێن دەگەنە دەربیجەکانی دڵ و لەوێ جێگیر دەبن.

---

260 Endocarditis
261 Staphylococcus
262 Streptococcus

## جۆرەکانی هەوی نێوپۆشی کامانەن؟

هەوی نێوپۆشی دڵ لە پێوەندیی لەگەڵ هۆکانی پێکهێنەری بە دوو چە شنی چڵکیی(بەکتریای) و ناچڵکی( یان خاوێن) دابەش دەکرێ. هەوی ناچڵکیی نێوپۆشی دڵ یان خاوێن لەگەڵ چەشنی چڵکی کەمتر دەبیندرەێ. پەرەگرتوویی هەوی نێوپۆشی دڵ لە پێوندەیی لەگەڵ هێزی نەخۆشکەری بەکتریا و ئازاردیتنی تان و پۆی نێوپۆشی دڵ دەتوانێ توند و سەخت (هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ[٢٦٣]) یان سووک و بە مەترسیی کەمتر بێ (هەوی ژێرکتوپڕی نێو پۆشی دڵ[٢٦٤]).

- **هەوی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ**

چەشنی هێرشکەری[٢٦٥] بەکتریا پێست، بە تایبەتیی ستافیلۆکۆکەکان لە ڕێگای خوێنەوە ڕەوانەی دڵ دەبن وهێرش دەبنە سەر دەریچە ساغەکانی دڵ. ئەم بەکتریایانە پاش زۆر بوونیان لە نێو دڵ، لە ڕێگای سیستێمی سووڕانی دڵ لە جەستەی مرۆڤدا بڵاو دەبنەوە و دەبنە هۆی چڵککردنی ئەندامەکانی دیکە بەتایبەتیی گورچیلەکان، سییەکان و مێشک. مەترسیی ئەم نەخۆشییە لە خووگرەکاندا کە بە شێوەیکی بەردەوام لە ڕێگای دە رزییەوە ماددەی سڕکەر بەکار دێنن زۆرتر لە خەڵکی دیکەیە. ئەم نەخۆشییە ئەگەر دەرمان نەکرێ لەوەدەچێ لەماوەی چەند ڕۆژ تا کەمتر لە ٦ هەفتە بە پێی پەرەگرتوویی نەخۆشییەکە، ببێتە هۆی مردن.

---

263 Acute endocarditis
264 Subacute endocarditis
265 Aggressive

- **هەوی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵ**

گروپـــی بـــەکتریایەکانی ســـترێپتۆکـــۆک وەکـــو Streptococcus Milleri، Mitis ، Mutans،Sanguis کە لـە حـاڵەتی ئاسـاییدا لـە نێو دە م و گەرودا دەژین، هۆی ئەم چەشنە نەخۆشییەن. ئـەو دەریچانـەی دڵ کـە پێشـــتر تووشـــی ئـــازاربوون، زۆرتـــر تووشـــی ئـــەم نەخۆشـــییە دەبـــن. دەرماننەکردنی ئەم نەخۆشییە دەتوانێ ببێتە هۆی مردنی نەخۆش لـە مـاوە ی ٦ حەوتو تا ساڵێک.

**لە چ کەسانێکدا مەترسیی هەوکردنی نێوپۆشی دڵ بەرزترە؟**

- ئەوانەی کە تووشی ئاڵۆزییەکـانی تەواوکـاریی زگمـاکیی دڵـن (وە ک نەبەسترانی دیواری نێوان دو دالانی دڵ).
- ئازار دیتنی دەریچەکانی دڵ، وەک لـە ئاکـامی یاو(تـا)ی رۆمـاتیزمی یان ئەستووریی دەریچەکان، کۆبوونەوەی کالسیۆم کە بەرهەمی چوونەسـە رێی تەمەنە، دەتوانێ ببێتە هۆی ئەستووری و ڕەقبوونی دەربیجەکان .
- دەریچەی دەستکرد یان ماددەی بێگانە لە دڵ وەکو ترپە ڕێکخەر.
- بەکارهێنانی ماددەی سڕکەر لە ڕێگای دەرزی لێدانەوە.
- نەخۆشـــییە درێژخایـــەنەکـــان کـــە دەبنـــە هـــۆی کزیـــی سیســـتێمی بەرگریی جەسـتە وەکـو نـەخـۆشـیی شـەکرە، ئەلکـۆلیـیبـوون، شـێرپەنچـە و شیمی دەرمانی(دەرزی کیمیایی)،
- نەشتەرگەری وەکو بڕین و دەرهێنانی ئاڵوو(لەوزەتین)[٢٦٦] .

---

266 Tonsillectomy

**نیشانەکانی هەوکردنی کتوپڕی نێوپۆشی دڵ کامانەن؟**

- بەرزبوونەوەی یاو
- سنگئێشە.
- پشووسواریی.
- کۆخین.
- پچڕانی وردە ڕەگەکانی لەپی دەست و پێ.
- لە کاتی سەختبوونی ئازاری دڵ نەخۆش تووشی شۆک و بێهۆشیی دەبێ.

**نیشانەکانەی هەوکردنی ژێرکتوپڕی نێوپۆشی دڵ کامانەن؟**

- ئارەقەی شەوانە.
- لەرزو تا.
- یاو.
- ئێشی ماسولکە وجومگە.
- ماندوویی.
- پشووسواری.
- سەرئێشە.
- بێئیشتیهایی.
- لەدەستدانی قورسایی جەستە.
- بەرهەمهاتنی گرێی ورد و ئێشدار لە ژێر پێستی قامکەکانی لاق و دەست[٢٦٧].
- پچڕانی وردە دەمارەکانی چاو، مەلاژک(مەلاشو)، سنگ و قامکە کانی دەست و پێ.

---

267 Osler nodes



**هەوکردنی نێوپۆشی دڵ چۆن دەسنیشان دەکرێ؟**

دیـــاریی‌کردنی هەوی نێوپۆشـــی دڵ بە پێـــی پێشـــینەی پزشـــکیی؛ دۆزینـەوەکانی فیزیکیـیو نیشـانەکانی ئەم نەخۆشـییە وەکـو یـاو؛ بیسـتنی دەنگــی نائاســایی دڵ، گۆڕانکــاریی نەواری(هێلکــاری) دڵ، تــاقیکردنەوە و چانـدنی خـوێن[268] (لە تـاقیگەدا بـۆ ناسـینەوەی ئەو بـەکتریایەی کە هـۆی نەخۆشـــییەکەیە) و ئێکۆکـــاردیۆگرافیی لە ڕێگـــای قـــوڕیژنکەوە[269] بـــۆ هەڵسەنگاندنی کاری دڵ و دیاریی‌کردنی برینی سەر دەربیجەکانە[270]




**برینی سەر دەربیجەی ئائۆرت**

268 Blood culture
269 Transesophageal echocardiogram
270 Vegetation

**ئالۆزییەکان و مەترسیی هەوکردنی نێوپۆشی دڵ کامانەن؟**

- ئاریتمیی دڵ.
- ناتەواویی دڵ.
- هێرشی دڵ(سەکتەی دڵ).
- هەوی دڵپۆش.
- جویبوونەوەی دەڵەمەی خوێن لە دیواری ڕەگەکان و ڕۆیشتنی بۆ مێشک، سییەکان و خوێنبەری کرۆنێریی دڵ کە دەبێتە هۆی سەکتەی دڵ و مێشک.

**هەوی نێوپۆشی دڵ چۆن چارەسەر دەکری؟**

لە هەوی بەکتریای نێوپۆشی دڵدا پێویستە بۆ ماوەی ٤ تا ٦ هەفتە ئەنتیبیوتیک وەکو پنیسیلین[٢٧١] و سفالۆسپۆرینەکان[٢٧٢] بە نەخۆش بدری.

**لە چ حاڵەتێکدا پێویست بە نەشتەرگەریی دڵ هەیە؟**

- ئازاردیتنی دەریچەکانی ئائۆرت و مەترالّ کە دەبێتە هۆی گەڕانەوەی خوێن و ناتەواویی دڵ.
- ناکۆکیی کاری دەریچەکانی دڵ و بەردەوام مانی چڵک دوای تێپەڕینی ١٠ ڕۆژ لە دەرمان بە ئەنتیبیوتیکێکی شیاو.
- زۆربوون و بە یەکنووسانی نائاسایی میکرۆبەکان کە دەبێتە هۆی بەرهەمهاتنی برین لە سەر دەریچەی دڵ کە ئەندازەی پتر لە١٠ میلیمەتر بێ.
- ئەو کاتەی کە کارگەکان(فطریات) هۆی نەخۆشیی بن. کارگەکان وڵامی شیاو بەدەوادەرمانیی نادەنەوە.

---

271 Penicillins
272 Cephalosporins

## بەشی سی و نۆ
## قەوارە و کاری کۆئەندامی میزومیزەڕۆ




**کۆئەندامی میزومیزەڕۆ لە چی پێکهاتووە و کاری چییە؟**

ئەم دەزگایە لە دوو گورچیلە، دوو بۆریی میز، میزڵدان و میزەڕێ پێکدێ و ئەرکی ئەو درووستکردن، کۆکردنەوە، راگرتن و رامالینی میزە.

**گورچیلە کان[٢٧٣] چین و چ کارێک دەکەن؟**

گورچیلەکان دوو ئەندامن لە شێوەی پاقلە. لە بەشی پشتەوەی بۆشایی گەدە (زگ) و کەمێک ژێرتر لە قەفەسەی سنگ جێگیرن و دەکەونە ئەملاو ئەولای بڕبڕەی پشت. هەر گورچیلەیەک نزیک بە یەک ملیۆن کەناڵ یان گورچیلکەی[٢٧٤] هەیە. ئەم کەناڵانە پێکهێنەری بینا و پێکهاتەی گورچیلەن و کاری سەرکیی ئەو بینایەش بەڕێوە دەبەن.

---

273 Kidneys
274 Nephron




**پێکهاتەی گورچیلە و گورچیلکە**

**کاری سەرەکیی گورچیلکە بریتییە لە:**

- دروستکردنی میز و جیاکردنەوەی کەرەستەی ناپێویستی وەکو ئوورە[٢٧٥]، کراتینین[٢٧٦] لە پلازمای خوێن وە دەرنانیان لە جەستەی مرۆڤ.
- ڕاگرتنی هاوسەنگی ئاو و ئەلکترۆلیتەکان[٢٧٧].
- دروستکردنی خڕۆکە سوورەکانی خوێن لە مۆخی ئێسکدا[٢٧٨].
- هاوسەنگ کردنی فشاری خوێن.

**کاری بۆریی یان لوولەی میز[٢٧٩] چییە؟**

بۆڕیی میز لوولەیەکی باریکە، میز لە گورچیلەوە بۆ میزڵدان دەگۆزێتەوە. درێژایی بۆڕیی میز ٢٥ تا ٣٠ سانتیمێترە.

---

275 Urea, ئوورە ئامانجی ئاڵوگۆڕی متابۆلیسمی ئەسیدیئەمینە لە جەستەدا.

276 Creatinine, کراتێنین ئامانجی لێکهەڵاوردنی کراتێنین فسفاتی ماسوولکەیە.

٢٧٧- Electrolyte ئەلکترۆلیت ماددەیەکە کە لە کاتی توانەوە لە تراوێکدا دەبێتە یۆن و دەتوانێ رەوتی کارەبا راگوێزێ.

278 Bone morrow

279 Ureter

**کاری میزڵدان[280] چییە؟**

میزڵدان ئەندامێکی ماسولکەییە، نزیک بە لیترێک میز لە خۆیدا ڕادەگرێ. کاری سەرەکیی میزڵدان کۆکردنەوەی میز و وەدەرنانیەتی.

**کاری میزەڕێ[281] چییە؟**

میزەڕێ پلوسکێکە و میز لە میزڵدانەوە بەرەو دەرەوەی میزڵدان ڕادەگوێزێ. درێژایی ئەم لوولەیە لە پیاواندا ٢٠ سانتیمەتر و لە ژناندا ٣ تا ٥ سانتی مەترە.

---

280 Urinary bladder
281 Urethera

## بەشی چل
## ناتەواویی و تێک چوونی کتوپڕی گورچیلە



### مەبەست لە تێک چوون و ناتەواویی کتوپڕی گورچیلە[٢٨٢] چییە؟

بە تێکچوونی کتوپڕی گورچیلە و هاتنەوە سەر حاڵەتی ئاساییەکەی و هاوکات زۆربوونی خەستایی کراتێنین و ئوورە، ناتەواویی گورچیلە دەگوترێ.

### هۆکانی ئەم ناتەواوییە کامانەن؟

- نەمان یان کەمبوونەوەی تراوی جەستە لە ئاکامی خۆێنبەربوون، ڕشانەوە، زگەشۆرە، سووتانی جەستە، ئارەقەکردنی لە ڕادەبەدەر و دابەزینی فشاری خوێن و ڕاچڵەکین.
- ماسینی جەستە وەک ئاکامی ناتەواویی دڵ یان نەخۆشیی جەرگ وەک سیرۆز[٢٨٣].

---

282 Acute Renal Failure

283 Cirrhosis,

تێکچوونی درێژخایەن و نەگەڕاوەی تانی جەرگ کە دەبێتە هۆی تێک چوون و تیاچوونی کاری ئاسایی ئەم ئەندامە.

- کارتێکەریی ژەهراویی دەواگەڵێکی وەکو ئامینوگلیکۆزیدەکان[٢٨٤] (چەشنێک ئەنتیبیوتیک) و دیکلۆفێناک[٢٨٥](دژە هەو) لە سەر گورچیلە.
- بەسترانی ڕێگای میز بە هۆی لوو و تومۆر، گەورەبوونی پرۆستات یا هەبوونی بەرد.
- قەپاتبوون و بەسترانی ڕێگەی خوێنبەرەکان.
- کەمخوێنیی گورچیلە بە هۆی کەمبوونەوە یا نەگەیشتنی خوێن.

**نیشانەکانی تێک چوونی کتوپڕی گورچیلە کامانەن؟**

لە سەرەتادا لەوەدەچێ نیشانەیەکی تایبەتیی نەبیندرێ، بەڵام بە پێی هاتنەخوارەوەی کاری گورچیلە ئەم نیشانانە وەبەرچاو دەکەون:

- بێ حاڵیی و ماندوویی.
- پشووسواریی.
- ماسینی جەستە.
- ناڕێک لێدانی دڵ بە هۆی زۆربوونی پتاسیۆمی خوێن.
- هەوی دڵپۆش بە هۆی زۆربوونی ئوورەی خوێن.
- کەمخوێنی.
- بێئیشتیهایی.
- بەرزبونەوەی فشاری خوێن،
- کۆما و تەنانەت مردن.

---

284 Aminoglycosides
285 Diclofenac

**قوناغەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

**قۆناغی یەکەم -** ئازاری گورچیلە، وەک ئاکامی کەمخوێنی یان کاریگەریی ماددەی ژەهراوی. لەم حاڵەتەدا بڕی میز ئاسایییە ( میزی ڕۆژانە تا ٢٠٠٠ میلیلیترە).

**قۆناغی دووهەم -** ئۆلیگئووریی[٢٨٦](بڕی میزی ڕۆژانە کەمتر لە ٥٠٠ میلیلیترە) یا ئانووریی[٢٨٧] (قەبارەی میزی ڕۆژانە کەمتر لە ١٠٠ میلیلیترە).

**قۆناغی سێهەم -** پۆلیئووریی[٢٨٨](بڕی میزی ڕۆژانە پتر لە ٢٠٠٠ میلیلیترە).

**قۆناغی چووارەم -** بڕی میزی ڕۆژانە ئاسایییە.

**دکتۆر بۆ ئاشکراکردن و زانینی ناتەواویی کتوپڕی گورچیلە چ دەکا؟**

دکتۆر خوێن و میزی نەخۆش دەنێرێ بۆ تاقیگە. لە نەخۆشانەدا ڕادەی کراتێنین و ئوورەی خوێن و پتاسیۆم دەچێتە سەرێ و کاری پاڵاوتنی گرمۆلەکانی[٢٨٩]گورچیلە کەمدەبێتەوە. لە میزدا لەوەدەچێ خوێن، پرۆتیینو خرۆکە سپییەکان ببیندرێ. هەروەها لە سۆنۆگرافیی بۆ هەڵسەنگاندانی ئەندازە و پێکهاتەی گورچیلە و نموونە لێ وەرگرتن لە تان و پۆی گورچیلە کەڵکوەردەگیرێ.

---

286 Oliguria
287 Anuria
288 Polyuria
289 Glomerular filtration rate[GFR]
کاری گرمۆڵەکان لە گورچیلە دا پاڵاوتنی شتی ناپێویستی خوێنە. Glomerulus,

### ناتەواویی کتوپڕی گورچیلە چۆن دەرمان دەکرێ؟




لە پلەی سەرەتادا دەبێ هۆکانی ناتەواویی کتوپڕی گورچیلە بزانرێ. شەکری خوێن و گوشاری خوێن دەبێ بە باشی کۆنترۆڵ بکرێن. بە پێی ئەو نیشانانەی کە دیتراون لە دەرمانی جۆراجۆر، هەروەها لە کاتی پێویستدا لە دەزگای دیالیز بۆ پالاوتنی خوێن کەڵکوەردەگیرێ.

# بەشی چل و یەک

## ناتەواویی و تێک چوونی درێژخایەنی گورچیلە



مەبەست لە ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە[٢٩٠] تێک چوونی بەردەوام و لە کارکەوتنی گورچیلەیە.

**هۆکانی ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە کامانەن؟**

- نەخۆشیی شەکرە.
- بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن.
- هەوکردنی درێژخایەنی گڕمۆڵەکانی گورچیلە.
- هەوکردنی درێژخایەنی گورچیلە و کاسۆلە[٢٩١].
- تێکچوونی کاری گورچیلە بە هۆی کیسکردنی گورچیلە.

---

290 Chronic Renal Failure

291 Renal pelvis,لەگەنچە






**کیس کردنی گورچیلە**

**نیشانەکانی ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە کامانەن؟**

- بێ حاڵیی و ماندووی.
- بێئیشتیهایی.
- بێخەوی.
- ماسینی لاق و دەوری چاو.

- بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن.
- ئێشی کەلەکە.
- دڵ تێکەڵاتن و ڕشانەوە.
- خورین و ئاڵۆشی پێست.
- پشووسواری.
- کەمخوێنی.
- بەرزبوونی مەترسیی خوێنبەربوون.

**پلەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

**پلەی یەکەم** - هاتنەخوارەوەی ڕادەی وەدەرنانی "کراتێنین" لە گورچیلە، سەرەرای ئاسایی‌بوونی ڕادەی کراتێنینی خوێن. چوونەسەرەوەی بڕی میز بە هۆی هاتنەخوارێی خەستییەکەی.

**پلەی دووهەم** - چوونەسەرەوەی کراتێنینی خوێن (تا٦میلی‌گرەم لە دسی‌لیتردا)، بە بێ ئاشکرابوونی نیشانەکانی ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە.

**پلەی سێهەم** - چوونەسەرەوەی کراتێنینی خوێن (پترلە ٦میلی‌گرەم لە دسی‌لیتردا) و ئاشکرابوونی نیشانەگەلێک وەکو ماندوویی، بێ حاڵی، زێدەبوونی گوشاری خوێن و وەرەم.

**پلەی چووار** - چوونەسەرەوەی کراتێنینی خوێن (تا ١٠میلی‌گرەم لە دسی‌لیتردا) و نیشانەکانی ئوورەی خوێن.

**دکتۆر بۆ دیاریی‌کردنی ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە چی دەکا؟**

دکتۆر خوێن و میزی نەخۆش بۆ تاقیکردنەوە دەنێرێتە تاقیگە. لەم نەخۆشانەدا ڕادەی کراتێنین، ئوورە، پۆتاسیۆم، فۆسفات دەچێتە سەرێ و بە پێی تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە، دەتوانێ ڕادەی هێمۆگلۆبین، پرۆتێین‌و

ئالبۆمینی خۆێن کەمبێتەوە، هەروەها لە میزدا ڕادەی وەدەرنانی پرۆتیین، ئالبۆمین، خڕۆکەی سوورو سپی بچێتە سەرێ. بۆ ئاگاداری زۆرتر لە تێک چوونی قەوارە و کاری گورچیلە، دەکرێ لە سۆنۆگرافی و کامپیۆتری، تۆمۆگرافیی کەڵک وەرگیرێ.

**ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە چۆن دەرمان دەکرێ؟**




**پاڵاوتنی خوێن بە یارمەتیی دەزگای دیالیز**

مەبەستی سەرەکیی دەرمان، کۆنترۆڵی هۆپێکهێنەرەکانی وەکو چوونەسەرەوەی گوشاری خوێن، شەکرە، چەوری، کەمخوێنی، هەروەها هاوسەنگکردنەوەی ئاو، ئەلێکترۆلیت و پرۆتیینە. لە کاتی پەرەگرتوویی ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە لە دەزگای دیالیز بۆ پاڵاوتنی خوێن کەڵکوەردەگیرێ.

## بەشی چل و دوو
## هەوی گرمۆڵەکانی گورچیلە



**مەبەست لە گرمۆڵە (گلۆمێرۆلۆس)[٢٩٢] چییە؟**






**گلۆمێرۆلۆس یا گرمۆلە** ـ پۆلێکە لە باریکە دەمارەکانی خوێن[٢٩٣] کە یەکەمین پلەی پاڵاوتنی خوێن بۆ پێکهێنانی میز لەوانەوە دەست پێ دەکا.

---

292 Glomerulus

**هۆکانی هەوی گرمۆڵەکانی گورچیلە کامانەن؟**

- بەکتریایەکان وەکو سترەپتۆکۆک، ستافیلاکۆک، پنومۆکۆک، هەوی جەرگ لە چەشنی ب و ....
- دەوا وەکو پنێسیلامین[٢٩٤].
- واکسەن(کوتان).
- تومۆری بێچارەسەر.
- نادیار.
- بە هۆی نەخۆشیی وەکو سیستیمیک لووپوس ئریتیماتۆز[٢٩٥]، سکلێرۆدێرمی[٢٩٦] و نەخۆشیی شەکرە.

---

293 Capillaries

294 Penicillamin

295 Systemic lupus erythematosus,سیستێمیک لووپوس ئریتیماتۆز،

چەشنێک نەخۆشیی خۆپارێزییە. چالاکیی سیستێمی بەرگری جەستە دژی تان و پۆی ئەندامەکانی جەستەی نەخۆشە و دەبێتە هۆی ئازاری ئەندام و تانەکان .

296 Scleroderma

سکلێرۆدێرمی چەشنە نەخۆشییەکی ڕوماتیسمییە کە پێستی نەخۆش ئەستوور، ڕەق و وشک دەبێ، لەوەدەچێ لە بەشی کۆتایی ئەندامەکاندا زام پێک بێ.




**سکلێرۆدرمی        سیستیمیک لووپوس ئریتیماتۆز**

- نەخۆشیی زگماکیی وەکو سیندرۆمی ئالپۆرت[٢٩٧].

**چەشنەکانی هەوی گرمۆلەکانی گورچیلە کامانەن؟**

- ✓ **هەوکردنی کتوپڕی گرمۆلەکان[٢٩٨]**

ئەم چەشنە زۆرتر پاش نەخۆشییەکی چڵکی، بە هۆی بەکتریا سترەپتۆکۆک لە گروپی **ئا** و نەخۆشییەکانی خۆپارێزیی[٢٩٩] پێکدێ. بوونی خوێن و پرۆتیین لە میزدا، چوونەسەرەوەی ڕادەی نیترۆژنی خوێن و هاتنەخوارەوەی ڕادەی پاڵاوتنی گڕمۆلەکانی گورچیلە، سەرئێشە، ئێشی

297 Alport- Syndrom,

نەخۆشییەکی زگماکیی و دووهەمین هۆی ژنێتیکیی(چینی) ناتەواویی گورچیلەیە. لەم نەخۆشانەدا هەوکردنی گرمۆڵەکانی گورچیلە، ئازاری گوێچکە و چاو دەبیندرێ.

298 Acute glomerulonephritis (GN)

299 Autoimmune diseases,

نەخۆشیی خۆپارێزیی. لەم نەخۆشییانەدا چالاکیی سیستێمی بەرگری جەستە دژی تان و پۆی ئەندامەکانی جەستەی نەخۆشە و دەبێتە هۆی ئازاری ئەندام و تانەکان.

جومگەکان، یاو، بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن و ماسینی جەستە بە هۆی ڕانەماڵینی ئاسایی خوێ و ئاو و پەنگخواردنەوەیان لە جەستەدا، هەناسەسواریی و کەمبوونی بڕی میزی ڕۆژانە لە نیشانەکانی ئەم چەشنەن.

✓ **هەوکردنی گرمۆڵەکان بە گۆڕانی هەرچی کەمترەوە**[٣٠٠]

ئەم چەشنە لە منداڵان، بە تایبەتی لە تەمەنی ٢ ساڵاندا دەبیندرێ. لەم نەخۆشانەدا نیشانەگەلێک وەک ماسینی دەم و چاو، بێ حاڵیی، چوونەسەرێی قورسایی جەستە، بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن، چڵک کردن، بەسترانی ڕەگ بە هۆی دەڵەمەی خوێن کە لە جێی خۆی جوێبۆتەوە و جوڵاوە[٣٠١]، سەرئێشە و سێندرۆمی نفرۆتیک[٣٠٢] دەبییندرێ. هۆی ئەم چەشنە نادیارە. بەڵام لە سەدا ١٠ تا ٢٠ی دەتوانێ بەرهەمی دەواگەلێکی وەکو دیکلۆفیناک، ئامپیسیلین، پنیسیلین، ریفامپین، ئنتێرفرۆن، نەخۆشیی مۆنۆنێکلۆزی چڵکی[٣٠٣]، شێرپەنجە و هتد ... ببێ.

---

300 Minimal-Change glomerulonephritis

301 Thromboembolism, .

*302* Nephrotic syndrome

سێندرۆمی نڤرۆتیک بریتییە لە هەبوونی پرۆتێین لە میزدا - زیاتر لە ٣،٥گەرام لە ڕۆژدا و چوونەسەرێی پرۆتیین و لیپۆپرۆتیینی خوێن. لیپۆپروتیین پێکهاتەیەکە لە چەوریی و پرۆتیین.

303 Infectious mononucleosis

مۆنۆنێکلۆزی چڵکیی یا نەخۆشیی ماچ، چەشنە نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە. نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە بریتین لە یاو، گەرو ئێشە، بێ حاڵی، ماندوویی و ماسینی گرێکانی لەنواویی.

### ✓ هەوی کتوپڕ پەرەگری گڕمۆلەکانی گورچیلە[٣٠٤]

لەم چەشنە نەخۆشییەدا هاتنەخوارەوەی کتوپڕی ڕادەی پاڵاوتنی گڕمۆلەکان بەلانیکەم تا سەدا ٥٠ لە ماوەی چەند ڕۆژ تا ٣ مانگدا دەبیندرێ. هۆی ئەم نەخۆشییە نەناسراوە، بەڵام لەوەدەچێ هۆی ژنێتیکیی هەبێ، یان لە چوارچێوەی نەخۆشییەکی سیستێمیکدا ببیندرێ. لەم نەخۆشییانەدا لەوەدەچێ ئەم نیشانانە وەبەرچاو کەون: یاو، سەرئێشە، ئێشی جومگەکان، بێ حاڵیی، بوونی خوێن لە میزدا، زۆربوونی کراتێنین و ئوورەی خوێن، هەروەها سێندرۆمی گودپاسچر[٣٠٥]



**سێندرۆمی گودپاسچر**

### ✓ هەوکردنی درێژخایەنی گڕمۆلەکان[٣٠٦]

زۆربەی چەشنەکانی هەوی کتوپڕی گرمۆلەکانی گورچیلە ئەگەر چارە نەکرێن دەبنە هەوی درێژخایەنی گرمۆلەکانی گورچیلە. لەم حاڵەتەدا قەوارەی گڕمۆلەکان تووشی تێک چوونێکی نەگەڕاو دەبێ و ڕادەی پاڵاوتنی بە شێوەیەکی بەرچاو دادەبەزی و ڕادەی کراتێنین و ئوورەی

---

304 Rapidly progressive glomerulonephritis

305 Goodpasture syndrome

نیشانەکانی سێندرۆمی گودپاسچر بریتین لە: پشوو سواریی، خوێن بەربوون سییەکان و خوێنپژاندن لە کاتی کۆخیندا.

306 Chronic glomerulonephritis (GN)

خوێن پەرە دەستێنی. لەم نەخۆشییانەدا نیشانەکانی خوارێ دەکرێ وەبەرچاوکەون: بێ حاڵی، ماندوویی، بێئیشتیهایی، دابەزینی نائاسایی قورسایی لەش، خورینی جەستە، وەرەم، بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن، فێ لێ هاتن، قۆڵنجی ماسولکەکان، پشووسوارییو سنگئێشە.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەسنیشان دەکرێ؟**

- تاقیکردنەوەی خوێن بۆ پێوانی ڕادەی پرۆتیین، کراتێنین، ئوورە، چەوریی، ئەلکترۆلیتەکان، ئیمونوگلۆبۆلین[307]، لیپۆپرۆتیین و ...،
- دەسنیشانکردنی هۆکانی چڵکی، وەکو: هەوی جەرگ لە چەشنی ب و س، ئایدز، مالاریا، سفیلیس و ...
- تاقیکردنەوەی میز بۆ پێوانی ڕادەی نائاسایی پرۆتیین، هەروەها خڕۆکە سوورو سپییەکانی خوێن لە میزدا.
- سۆنۆگرافیی بۆ دیارییکردنی گۆڕانکاری قەوارەی گورچیلە.
- بیۆپسی لە تان و پۆی گورچیلە بە تایبەتیی ئەگەر لەو نەخۆشانەدا نیشانەکانی سێندرۆمی نفرۆتیک ببیندرێ.

**دکتۆر بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە چ دەکا؟**

- ✓ ئەنتیبیوتیک وەک پنیسیلین بۆ لە ناوبردنی هۆی چڵک،
- ✓ هاوسەنگ کردنی ئەلکترۆلیتەکانی جەستە.
- ✓ دەرمانی وەرەم و بەرزیی گوشاری خوێن.
- ✓ لە کاتی سەختبوونی نەخۆشییەکە لە کورتیکۆسترۆئیدەکان (پرێدنیزۆلۆن) و دەواگەلێکی وەکو ئازاتیۆپرین[308]، سیکلۆسپۆرین[309] کەڵک وەردەگیرێ.
- ✓ دیالیز.

---

307 Immunoglobulin

ئیمونوگلۆبۆلین چەشنێک دژە جەستە (Antibody) کە رۆڵێکی بەرچاوی لە سیستێمی بەرگری جەستەدا هەیە.

308 Azathioprin

309 Cyclosporine

# بەشی چل و سێ
# چڵککردنی گورچیلە[310]



a kidney afflicted with pyelonephritis.

## چەشنەکان و هۆکانی چڵککردنی گورچیلە کامانەن؟

ئەم نەخۆشییە دەتوانێ کتوپڕ یاخود درێژخایەن بێ. چڵککردنی کتوپڕی گورچیلە ئاکامی چونەسەرێی بەکتریا لە بەشی خوارەوەی ڕێگای میزبەر بەرەو ژوورە. لە ژناندا بە هۆی کورتبوونی ڕێگای میزبەر بە بەراوەرد لەگەڵ پیاواندا، هەروەها لەو کەسانەی کە تووشی نەخۆشیی شەکرەن بە پێی دابەزینی هێزی بەرگریی جەستەیان، ئەم نەخۆشییە زۆرتر وەبەرچاو دەکەوێ. لە نێو بەکتریایەکان ئێشێریشا کۆلیی[311] (تا سەتا پەنجای بوارەکان)، پرۆتێوسمیرابیلیس[312] و کلێبسیلا[313] هۆی سەرەکیی

310Pyelonephritis
311 E. Coli
312 Proteus mirabilis
313 Klebsiella

ئەم نەخۆشییەن. لە منداڵی ساوا یان کۆرپەدا چڵککردن لە ڕێگای خوێنەوە دەگوێزرێتەوە و دەتوانێ ببێتە هۆی پێکهاتنی ئابسەی گورچیلە.

**نیشانەکانی چڵککردنی گورچیلە کامانەن؟**

- تا و لەرز.
- زگئێشە و پشتئێشە.
- ئێشی کەلەکە (لە منداڵاندا ئێشی کەلەکە کەمتر دەبیندرێ و ئەوان زۆرتر تووشی سکئێشە دەبن).



- سەرئێشە.
- ئێش، خورین (ئاڵۆش) و برژانەوەی ڕێگای میزبەر لە کاتی میزکردندا،
- چڵک یان خوێن لە میزدا.
- زوو بە زوو و بە پەلە میزکردن.
- قەبزبوون.
- دڵتێکەڵاتن و ڕشانەوە.

ئەم **نەخۆشییە چۆن دەستنیشان دەکرێ؟**

✓ پشکنینی میز: بۆ دیاریکردنی باکتریەکان و زۆربوونی خڕۆکە سپییەکان.

✓ سۆنۆگرافیی گورچیلە بۆ دیاریکردنی بەرد و ئابسە.




**Focal Pyelonephritis**

✓ تاقیکردنەوەی خوێن: بەرزبوونەوی ڕادەی خڕۆکە سپییەکان و پرۆتیینەکانی خوێن، لە بەرامبەرهەو یان چڵککردن; کراتێنینو ترانسئامینازەکان[٣١٤].

**ئاڵۆزییەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

- سێپسیس[٣١٥].

---

314 Transaminase

چەشنێک ئانزیمن کە زۆربوونیان لە خوێندا دەتوانی نیشاندەری نەخۆشی جەرگ، دڵ یاخود سیستمی ئسکلێت و ماسولکە و هتد بێ.

- ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە.
- ئابسەی گورچیلە.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەرمان دەکرێ؟**

- دانی ئەنتیبیوتیک  بۆ ماوەی ٧ تا ١٠ ڕۆژ.
- خواردنەوەی شلەمەنی.
- پشوودان.

---

٣١٥- Sepsis چڵککردنی خوێن بە هۆی بەکتریاوە.

## بەشی چل و چوار
## بەردی گورچیلە[٣١٦]




بە درووستکردنی بەرد لە گورچیلە و ڕێگای ماشتنی (ڕامالّینی) میزدا – نفرۆلیتیاز دەگوترێ.

**هۆکانی درووستبوونی بەرد لە گورچیلەدا کامانەن؟**

- زۆربوونی لە ڕادەبەدەری ماددەگەلێک لە میزدا، کە بەرد درووست دەکەن وەکو:
- کالسیۆم ،فۆسفات، ئەسید ئووریک، ئۆکسالات[٣١٧] و سیستین [٣١٨].
- کەمبوونی ماددەگەلێک لە میزدا، کە بەرلە درووستکردنی بەرد دەگرن وەکو: سیترات و مەگنێزیۆم.
- بێ جووڵەیی بێچالاکیی.
- کەمخواردنەوەی شلەمەنی.
- خواردنی چێشتی پرۆتییندار وەکو گۆشت.
- برسێتیی و دابەزینی قورسایی جەستە.
- چڵکی گەڕاوەی ڕێگای میزبەر .
- نەخۆشیی شەکرە.

---

316 Nephrolithiasis
317 Oxalate
318 Cystie

- دەوا(دەرمان) وەکو: Triamterene, Silicate, Sulfasalazine, و ڤیتامین D،
- نەخۆشیی نقرس.

**نیشانەکانی ئەم نەخۆشییە کامانەن؟**

لە کاتی نەبەسترانی ڕێگای میزبەر لەوەدەچێ نیشانەیەکی تایبەتیی نەبیندرێ، بەڵام لە کاتی داخزین و جێگۆڕکێی بەرد، دەکرێ ئەم نیشانانە وەبەرچاو کەون:

- قۆڵنجی گورچیلە (ئێشی کەلەکە دەتوانێ بە پێی داخزین و جێگۆڕکێی بەرد بەرەو پشت، ژێرزگ و لاڕان تەشەنە بکات).




- دڵ تێکەڵهاتن و ڕشانەوە.
- یاو و ئارەقەکردن.
- بوونی خوێن لە میزدا.

**گیروگرفتەکانی بەردی گورچیلە کامانەن؟**

گیروگرفتەکانی بەردی گورچیلە لەوەدەچێ ئەمانە بن:

- ✓ چڵکی ڕێگای میزبەر.

- ✓ چڵکی درێژخایەنی گورچیلە.
- ✓ ناتەواویی درێژخایەنی گورچیلە.

**بەردی گورچیلە چۆن دەستنیشان دەکرێ؟**

بۆ دەستنیشانکردنی بەردی گورچیلە دەکرێ ئەم کارانە بکرێ:

- پشکنینی میز لە تاقیگەدا، چونکە زۆرجار خوێنی ناو میز بەچاو نابیندرێ.
- سۆنۆگرافیی.




بەردی گورچیلە لە سۆنۆگرافییدا(بڕوانە پەیکانە(سەهم) کە)

- وێنەگرتن، بۆ ئاگاداربوون لە هەبوونی بەرد لە گورچیلەدا.



بەردی گورچیلە لە ڕادیۆگرافییدا

- پشکنینیی بەرد لە تاقیگەدا بۆ دەستنیشانکردنی چەشنی بەردەکە.

**چەشنی بەردەکان کامانەن؟**





**بەردی ئوورات          بەردی سیستین**

بەردی گورچیلە و پێکهێنەرانی بەردەکان:

- بەرد لە چەشنی کالسیۆم ـ ئۆکسالات (سەدا شەست).
- بەرد لە چەشنی کالسیۆم ـ فۆسفات (سەدا بیست).
- بەردی ئوورات (سەدا دە تا پازدە).
- بەردی مەگنێزیۆم ـ ئامۆنیۆم ـ فۆسفات ( سەدا پێنج تا دە).
- بەردی سیستین.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەرمان دەکرێ؟**

- کەڵک وەرگرتن لە ئێش بڕ، وەک نوالژین، دۆلانتین و ....
- کەڵک وەرگرتن لە دەواگەلی گرژی بڕی(خاوکەرەوە)[٣١٩] ماسولکە (سپاسمۆلیتیک)، وەکو بوسکۆپان[٣٢٠].
- بەکارهێنانی ئەنتیبیوتیک لە کاتی چڵکی ڕێگای میزبەردا.

---

٣١٩- قۆڵنجبڕ.

320 Buscopan

- ئەگەر بەرد گەورەتر لە سانتیمەترێک بێ، پێویست بە نەشتەرگەریی هەیە.
- شکاندنی بەرد بە لێدانی شەپۆلی دەنگ[321] .




**شکاندنی بەرد بە لێدانی شەپۆلی دەنگ**

- نەشتەرگەریی لووی پاراتیرۆئید. بەشێک لە بەردەکان کە لە چەشنی کالسیۆمن بە هۆی پڕکاریی لووی پاراتیرۆئید دروست دەبن.

---

321 Extracorporeal Shock Wave Lithotripsy (ESWL)




**لووی پاراتیرۆئید**

**بۆ پێشگرتن له درووستبوونی بەرد له گورچیلەدا چ دەبێ بکرێ؟**

- خواردنەوەی ئاو(شلەمەنی ٣ ـ ٢ لیتر له ڕۆژدا).
- کەمخواردنی پرۆتێینی ئاژەڵیی.
- له هەبوونی بەرد له چەشنی کالسیۆم له گورچیلەدا، بەکارهێنانی دەواگەلی میزهێنەری وەکو تیازێدەکان که یارمەتیدەری درووستنەکردنی بەردن.
- له هەبوونی بەرد له چەشنی ئۆکسالات له گورچیلەدا، ئامۆژگاری دەکرێ که سپێناخ، ڕێواس، ئاجیل، بادام، کاکاو و چای ڕەش به کەمی بخورێن یا بخورێنەوە.
- پیاسەکردن و وەرزشی بەردەوامی ڕۆژانه بۆ ماوەی ٢٠ خولەک.

# بەشی چل و پێنج
## شێرپەنجەی خانەکانی گورچیلە




بە تومۆری بیچارەسەری تان و پۆی گورچیلە، شێرپەنجەی خانەکانی گورچیلە[٣٢٢] دەگوترێ.

**هۆکانی شێرپەنجەی خانەکانی گورچیلە کامانەن؟**

هۆکانی شێرپەنجەی خانەکانی گورچیلە نادیارن، بەڵام لەوەدەچێ ئەوانەی کە لە ژێرەوە باسیان دەکەین مەترسیی ئەم نەخۆشییە بەرزکەنەوە:

- ✓ جگەرەکێشان مەترسیی ئەم نەخۆشییە تا دوو هێندە بەرزدەکاتەوە.(لەسەدا ٢٠ هەتا ٣٠ی نەخۆشەکاندا).
- ✓ قەڵەویی.
- ✓ بەکارهێنانی لە ڕادەبەدەری ئەو دەواگەلەی کە Phenacetin ـ یان[٣٢٣] تێدایە.

---

322 Renal cell Carcinoma

- ✓ کیستی گورچیلە لەو نەخۆشانەی کە خوێنیان بە یارمەتی دەزگای دیالیز دەپاڵێون.
- ✓ بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن.
- ✓ پێوەندیی گورچیلە.
- ✓ پاڵاوتنی درێژخایەنی خوێن بە یارمەتی دەزگای دیالیز.



**فرە کسیستیی گورچیلە**

**نیشانەکانی شێرپەنجەی خانەکانی گورچیلە کامانەن؟**

لە سەرەتادا نیشانەیەکی تایبەتی نابیندرێ، بەڵام دواتر بە پێی پەرەگرتنی نەخۆشییەکە، لەوەدەچێ ئەم نیشانانە وەبەرچاو کەون:

- بوونی خوێن لە میزدا تا سەدا ٤٠ی بوارەکان.
- ئێشی کەلەکە تا سەدا ٤٠ی بوارەکان.

---

323 چەشنە ئێشبڕێکە کە لە ساڵی ١٨٨٧ زایینی هاتە نێو بازاڕەوە و وەکو یەکێک لە یەکەمین دەواگەل بۆ هێنانەخوارەوەی یاو کەڵکی لێوەردەگیرا.

- یاو تا سەدا ٢٠ی بوارەکان.
- کەم خوێنیی.
- هاتنەخوارێی قورسایی جەستە تا سەدا ٣٣ ی بوارەکان.
- گەورە بوونی باتوی[٣٢٤] چەپ بە هۆی بەسترانی خۆینبەری باتو[٣٢٥].
- ـ پۆلیسیتێمی[٣٢٦]، زۆربوونی نائاسایی قەبارەی خوێنی جەستە.
- ـ چوونەسەرێی کالسیۆمی خوێن.
- ـ بەرزبوونەوەی گوشاری خوێن تا سەدا ٢٠ی بوارەکان.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەسنیشان دەکرێ؟**

- کامپیوتر تومۆگرافیی لەگەڵ کەڵکوەرگرتن لە ماددەی ڕەنگی (ماکی ئۆپاک)
- شکڵ درووستکردنی موگناتیزیی بە دەنگی بە هێز[٣٢٧].



**پەیکانەکە شێرپەنجەی گورچیلە نیشان دەدا**

324 Varicocele
325 Testicular Vein
326 Polycythemia
327 MRI ـ Magnetic resonance imaging

- سۆنۆگرافیی.




**شێرپەنجەی گورچیلە لە سۆنۆگرافیی‌دا**

- پشکنینی خوێن بۆ دیاری‌کردنی مارکێرەکانی شێرپەنجە[٣٢٨].
- پشکنینی میز: بوونی خوێن لە میزدا.

**ئەم نەخۆشییە چۆن دەرمان دەکرێ؟**

لە سەرەتاکانی نەخۆشیی یەکەداجاری واهەیە لە نەشتەرگەریی کەڵکوەردەگیرێ. لەوەدەچێ تا سەدا ٩٠ ئەم کارە ببێتە هۆی دەرمانی نەخۆشییەکە، بەڵام لە قۆناغی پەرەگرتوویی و بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکە دەکرێ لە تیشکدەرمانیی[٣٢٩] و شیمیی‌دەرمانیی کەڵکوەربگیرێ.

---

328 Cancer markers
329 Radiation Therapy